# ڕۆژەکانی ئێران

نووسینی: شارچی ڕۆزڤێلت
کەریمی حسامی لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

ستۆکهۆلم- ١٩٩٥

# ڕۆژەکانی ئێران

نووسینی: ئارچی ڕۆزڤێلت
کەریمی حسامی لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

ستۆکهۆلم- ١٩٩٥

## پێناسی کتێب :

ناوی کتێب : رۆژەکانی ئێران

نووسەر : ئارچی بالد رۆزولت

وەرگێر : کەریمی حسامی

مۆنتاژ : ناسری ئیبراهیمی

چاپی یەکەم - رێبەندانی ۱۹۹۵ ستۆکهولم

ISBN 21-630-340-5-1

# رۆژەکانی ئێران

رۆژەکانی ئێران سەر باسی فەسلێکە لە کتێبی( شوقی اموختن )
نووسینی < ئارچیبالد روزولت> یەکێ لە مەئمورە چالاکەکانی رێکخراوی
‹سی . ئا. ئێ› ئەمریکا و مەئموری کۆ کردنەوەی ئاگاداری و زانیاری لە
ولاتانی ئەفریقای عەرەبی ورۆژ هەلاتی ناوە راست و ئێران و تورکیا بوە.
شارەزایێکی یەکجار زۆری لەم هەرێمە هەیە. دیارە ئەم کتێبەی بە شێوەی
بیرە وەری نووسیوە، بەلام خوێندنەوەی چێژێکی تایبەتی هەیە و خوێنەر لە
گەلێک شێوەی کار و تێکۆشانی رێکخراوی < سی .ئا . ئێ > و
مەئمورەکانی جاسوسی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئاگادار دەکات.

ئەم بەشەی کتێبی ناو براو کە پێوەندی راستەو خۆی بە ئێران و
کوردستانەوە هەیە لە وانەیە بۆ خوێنەری کورد تام و چێژی تایبەتی هەبێ.
هەر چەندە وەرگێر لەگەل هەموو بو چوون و لێکدانەوەکانی نووسەر

موافیق نیە، بەڵام بە مەبەستی ئاگاداری زیاتری خوێنەری کورد لە روو داوەکانی نیشتمانەکەی و گەلیک بە سەر هاتی نادیار بە وەرگێرانێکی ئازاد کردویە بە کوردی.

## ورچی رووس و شێری ئێران

رۆژی ٩ی مانگی مارسی سالی ١٩٤٦، دوای چەند ئیستێک لە رێگادا، بە فرۆکەی هێلی هە واتی ئینگلستان کە بە زەحمەت بە نێو هەورەکانی لە زەوی ئیزیک لە فرۆکە خانە نیشت، گەیشتمە ئێران. سەر باز و ژاندارمە چاوە روانی هاتنەوەی قەوامو سەلتەنەی سەرۆک وەزیر بوون کە لە موسکو دەگەرایەوە. بەم بۆنەوە فرۆکە خانە و شەقامی لە فرۆکە خانەوە بۆ شار پاوان کرا بوون. بەڵام فرۆکەوانی وریا و بە هەستی رووس کە بریاریان دابوو ئەو رۆژە نە یەنە خوار، رۆیشتن، رۆژی دوایی گەرانەوە.

رۆژیکی سارد و بارانی بوو. چیا جوانەکانی دیمەنی تاران لە نێو مژو تومانەدا بە جوانی دیار بوون.- دەلێم «بوون» چونکە بە داخەوە ئیتر ناکری ئەم چیا هەمیشە سەر بە بەفرانە بە هاسانی تەماشا بکەی. چونکە زنجیرە چیای ئەلبورز هەر وەک لوتکەی ( ئیستا سیهوزاتل) و( پوپوکاتیل)ی مەکزیکۆسیتی لە ژێر پەردەی دووکەلی هەزاران کۆنە دوکەلکیشی

ژەنگاوی لە بەر چاو شاردراونەوە.

دڵە کوتەم گرتبوو. ئاخر من لە حەساسترین کاتی مێژوویی پڕ لە کارەساتی ئەم سەر زەمینە جادووییە دەچوومە وێندرێ و قاچم تێ دەنا. وا دێتە بەر چاو کە رووسەکان ئاخرەکەی خەریکن خەونی چەند سەد ساڵەیان وەدی بێنن. هەر ئەو خەونەی کە ماوەیەکی زۆر فیکری گەلێک لە سەر کەوتوانی مێژووی بە خۆوە خەریک کرد وە. من لەو باوەرە دا بووم کە دەتوانم بە شێوەیەک بەشێک لەو کۆسپە بم کە پێشی وەدیهاتنی خەونەکانی ئەم زلهێزانە بگرێ. رووسەکان لە سەر دەمی پێتری کەبیرەوە لە رێگایێک دەگەرێن کە دەستیان بگاتە ئاوەکانی باشور. واتە ئاوەکانی بوسفۆر و داردانیل و خەلیجی فارس.

رووسەکان لە سەرە تاوەچاویان بڕیە بنکۆڵکردنی وردەی ئیمپراتۆری تورکی وەسمانی و توانیان بە گرتنی کریمە و عەرزەکانی دراوسێ تیتۆلێکی درێژیان لە بەشی سەرووی دەریای رەش دابڕن. پاشان بە یارمەتی لەشکری خۆیان و ولاتانی بالکان، بە تایبەت بولغارستانی سلاڤیان لە دراوسیەتی تراس سەر بە خۆ کرد کە ئاخرین ولاتی ئوروپایی ژێر دەستی تورکان بوو لەو بەری دالانی بۆسفۆر و داردانیل دا.

ئەوان هەر وەها لە شەڕی خوێناویدا بە یارمەتی گورجیە مەسیحی و ئەرمەنیەکانی دانیشتووی خوارووی قەفقاز قەومە سەر بە خۆو مسلمانەکانی قەفقازیان سەر کوت کرد. لە سەرە تای سەدەی رابردوو بەشی سەرووی ئوستانی ئازەربایجانیان لە گەڵ چالاوەکانی ئەوتی لە ئێران داگیر کرد و لکاندیان بە خاکی خۆیانەوە.

بولشەویکەکانیش دوای سەر کەوتن روویان کردە باشور و توانیان دەولەتە ناسیونالیستە تازەکان کە دوای شەری یێکەمی دنیا گر لەو بەری قەفقاز دامەزرا بوون، بە هاسانی برووخێنن و دەستەی شۆرشگێری جیا وازیخواز لە بەشی ئازەربایجان و ئوستانی دراوسێ یان- واتە گێلان- بێننە سەر کار لە ژێر چاوە دێری ئۆردوی سووردا.

دوای شکانی تەقەلای سۆڤێت بۆ سەقامگرتوویی رێژیمەکانی بۆلشەویکی لە ئوروپای رۆژ هەلات بە تایبەت مەجارستان، سیاسەتی ئەم ولاتە گۆرانی بە سەر داهات. سالی ١٩٢٠ لێنین بریاری دا کە تێکۆشانی شۆرشگێری سۆڤێت بە کەلک وەر گرتن لە درۆشمی ئینترناسیونالیستی حیزبی تازە دامەزراوی کومونیست بەرەو هیندوستان و رۆژ هەلاتی ناوە راست بچێت. لە هاوینی ئەو سالە دا کۆنگرەی نەتەوەکانی رۆژ هەلات - کە بەشی زۆری لە نوێنەرانی مسلمانی بیست میلیەت پێکهاتبوو - لە باکو لە ژێر چاوە دێری سەرۆکی کۆمینتێرن( گریگۆری زینویف ) بەسترا. ئەو داوای لە ئەندامانی کۆنگرە کرد کە لە ژێر ئالای (خەزای خەلک) - تێکەلاوێکی سەیر لە ئیسلام و کۆمونیزم - دژی ئیمپریالیزمی ئینگلستان خەبات بکەن.

لێنین بە سەرنجدانی ئەم لاگری یە، گەیشتبوە ئەم ئەنجامە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی دژی ئیستیعماری سۆڤێتی، پێویستە جارێ لە ئێران پاشە کشە بکات. ئەم بریارەش بە بەستنی پەیمانی ئاشتی سالی ١٩٢١ بە ئەنجام گەیشت.

هەر لەو سالە دا لە ئێران لە لایەن سەید زیائەدینی تەبا تەبایی

ناسیونالیستی خۆ پاریز، به پشتیوانی ره زاخانی قازاخ کودیتایەک کرا. بەلام رەزاخان وردە وردە دەسەلاتی گرتە دەست و بە ناوی ( رەزا شای پەهلەوی ) خۆی کردە شای ئیران و سەید زیاشی دوور خستەوە. ( ئیمە دوایە دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسە )

تورکیاش کە دوای شەری یێکەمی دنیا گر کەنەفت و لاواز ببوو، بە هەلبژاردنی مستەفا کەمال( ئەتا تورک ) توانی سنوری قەفقاز و دالانەکانی خۆی بپارێزێ. دەسەلاتی تورکیا بە سەر داردانیل و بۆسفۆر دا لە گەل مافی ئازادی دەریا پێوان لەم دالانەدا، سالی ۱۹۳٦ بە پەیمانی ( مۆنترۆ ) کە ئینگلستان و یێکێتی سۆڤیێتی و ولاتانی بالکان واژۆیان کرد، مسۆگەر کرا.

سالی دوایی تورکیاو ئیران و ئەفغانستان پەیمانی سەعداوادیان ئیمزا کرد و رێک کەوتن کە دژی دە ست تێوەردانی هێزی بێگانە ( واتە یێکێتی سۆڤیێتی) پشتیوانی لە یەکتر بکەن.

رەزا شا بە لاسا کردنەوەی ئەتا تورک کەوتە کار تا لە ئیرانیش رێژیێکی غەیرە مەزهە بی دابمەزرێنێ. ژن مەجبور کران رووبەند و پەچە لابەرن و پیاو لیباسی شێوە ئورووپایی لە بەر بکەن و شەپکە لە سەر بنێن. عێل و عەشایر سەر کوت کران. سەرە رای بێزاریان لە دانانی لیباسی سوننەتی زۆر لە وان لیباسی سوننەتی و ناوچەیی خۆیان شاردەوە بە هیوای هاتنی رۆژەکانی باشتر. بەلام ئەم گۆڕانکاریە لە باری فیکری و بەدەنیشەوە روالەتی بوو. هەستی عەشیرەتی و ئایینی سەر کوت کرا. بەلام بە تەواوی لە بەین نەچوو. هەر وەک پزیسکی بن خۆلە مێش مایەوە

و نه کوژایەوە.

لە ئاخری دەیەی ١٩٣٠ رەزا شا لە گەڵ ئەڵمان پێوەندیەکی نیزیکی دامەزراند بۆ ئەوەی بتوانێ هەرەشەی دەست درێژی رووسیا و ئینگلستان بکاتەوە هیچ. ئەم پێوە ند یە بە دەست پێکردنی شەری دووەم گەرمتر بوو. بە تایبەت کە لە سەرەتاوە ئەڵمان سەر کەوتوو دەهاتە بەر چاو. ئێران بە سەدان پسپۆر و راوێژ کاری ئەڵمانی هێنا بوون لە بنیاتەکانی دەوڵەتی و ئەرتەشیدا کاریان دەکرد.

لە مانگی ئوتی سالی ١٩٤١دا، واتە ئەو کاتەی کە رەزا شا داخوازی سۆڤیێت و ئینگلیزی بۆ وەدەر نانی ئەڵمانیەکان رەت کردەوە. ئەم دوو دەوڵەتە بە هاو کاری تەواو ئێرانیان بە بێ بەر بەرەکانی داگیر کرد. سەرووی وڵات کەوتە ژێر دەسەلاتی سۆڤیێت و خوارووش بەر دەستی ئینگلیز. سنووری ئەم دوو بەشە هێلێکی گریمانی هە بوو بە نێو تاراندا دەکشا و شاری تارانیش داگیر کراوی هەر دووکیان بوو. رەزا شا دوور خرایەوە. تاج و تەختی بۆ حەمە رەزای کوری بە جێهێشت.

شای لاو لە بەرانبەر دەسەلاتی پەلامار دەراندا هیچی لە دەست نەدەهات. تازە دوو سالیش بوو بە سەر ئەو میللەتە کەنەفت و شکاوە دا پاشایەتی دەکرد کە رێبەرانی سێ دەسەلات، واتە ( رۆزولت و ستالین و چرچێل ) لە تاران کۆ بوونەوە و چاویان پێک کەوت. ئەم سێ هێزە لە سەرە تاوە گوێیان نەدا بە ئێران. بالیوز خانەکانی سۆڤیێت و ئینگلستان تەنیا چەند رۆژ پێش کۆبوونەوە ئێرانیان ئاگا دار کرد بوو. بە (لوئیز دریفوس) بالیوزی ئەمریکا گوترا بوو کە هیچ شتێک بۆ دەولەتی ئێران

روون نه کاتەوە.

دوو بالیوز خانە کانی دیکە ئەویشیان مەجبور کرد کە پیڕەوی لە وان بکات. پاشان پێشنیاری وەزیری دەر باریش(حوسێنی عەلا)

بۆ جیگای کۆ بوونەوەی کۆنفرانس لە کۆشکی پاشایەتی رەت کرایەوە. کەس گرنگی بە کاردی ئیحترام نەدا کە ئێرانیەکان لە فرۆکە خانە ئامادەیان کرد بوو. فرانکلێن رۆزولت -یش بە پێچەوانەی ستالین و چرچێل نە چوە کۆشکی شاو لە دیتنی ئەو خۆی بوارد. شاهەنشای ئێران ناچار بوو خۆی بۆ ئەم زەلالەتە مل راکێشێ و بۆ دیتنی رۆزولت بچێتە بالیوز خانەی سۆڤیتی و ماوەیێکیش چاوە روان بێت تا بتوانێ بیست دە قیقە لە گەڵ سەر کۆمار وتو وێژ بکات. بیست دەقیقەش ئەوە نە بوو کە بتوانی مەسەلە گرنگە کانی ولات باس بکات. مەسەلەی ئێران یەکێ لەو مەسەلە باسکراوانەی کۆ بوونەوە بوو کە دەیتوانی لە رەوەندی مێژوو دا تا رادەیەک بۆ بەرژەوەندی ئەم شتەی کە پاشان بە(دنیای ئازاد) ناو برا، کەلکی هەبێت. بەلام لە بارەکانی دیکە و لە وانەش مەسەلەی دوا رۆژی سەر دەمی ئاشتی ئەنجامێکی کارە ساتاوی هەبوو. هەر چەندە یارمەتیشی بە سەر کەوتنی شەر کرد.

****

شەوی ٢٧ی نوامبری ١٩٤٣ پاش ئەوەی سێ رێبەر گەیشتنە تاران، فرانکلین روزولت لە بالیوز خانەی ئەمریکاوە گواستیەوە بۆ بالیوز خانەی سۆڤێت لە تاران و لە تەواوی ماوەی کۆنفرانسدا هەر لە وێ مایەوە.

تەواوی وتار و ناخافتنەکانی کەوتنە بەر دەزگای بیسەری سۆڤیێتەکان و خزمەتکارەکانیشی هەموویان لە ئەندامانی (ن. ک. و. د ) و تەنانەت چەند ئەفسەری پایە بەرزی ئەم ڕێکخراوەیەش بوون.

بەمجورە ستالین کە لە نیزیک ژوورەکەی ئەو نیشتە جێ ببوو، دەیتوانی زۆر زوو دەستی وێرا بگات. دوو جاریش چاو پێکەوتنی تایبەتیان هەبوو. لە کاتێکا ڕۆزولت لە چاو پێکەوتنی ئاوا لە گەل چرچێل خۆی بوارد بوو. ئەوەش بەم بیانوە کە نەکا ( مامە جۆ)

( جۆزێف ستالین) وابزانێ کە چرچێل و ڕۆزولتە دەیانەوی دژی ئەو پیلان بگێڕن. لە کۆبونەوەکانی کۆنفرانسیش دا فرانکلین ڕوزولت لە مەسەلەکانی بە کێشە دا، لایەنی ستالینی دەگرت.

کارە ساتی کۆنفرانسی یالتا بە هۆکاری ئەم هۆیە دانراوە کە لە کاتی ئەم کۆنفرانسە دا، ڕۆزولت لە سەرە مەرگ دابوە. بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە کۆنفرانسی یالتا تەنیا بریار و باسەکانی کۆنفرانسی تارانی کردە ڕەسمی کە (لە کاتی سلامەتی ئەودا) بۆ دانی ئیمتیاز بە سۆڤیێت بەسترا بوو. ئەوەش لە کاتێکا ولاتە یەکگرتوەکان کارتی بردنەوەی بە دەستەوە بوو. دەکرێ بیروڕای خەیانەت بە بێ شک و گومان ڕەت کرێتەوە. هیچ کار بە دەستێکی ئەمریکایی کە لە سیاسەتی ولات دا ئەخشێکی گرنگی بوو بێت، نە کەوتۆتە ژێر نفوزی سۆڤیێتەوە. هۆی ئەم کارەی ڕۆزولت لە ڕاستیدا کەسایەتی ئەو بوو. ئەو لەو بڕوایە دابوو کە تەنیا خۆی دەتوانێ لە گەل ستالین بدوێ و لە هەلوێستی دۆستانە لە گەل ستالین کەلک وەرگرێ.

له راستیدا فرانکلین رۆزولت ئەبیعەتی ( خانێکی گوندی ) هەبوو .ئەو
له کاتی خوێندندا لەو خوێندکارانه بوو که موتالایەکی ئەوتۆی نەبوو.
تەنیا له رێگای سەفەری توریستیەوه که تۆرەمەی ئەشرافی ئانگلو
ساکسون حەزیان لێبوو، شارەزای ئوروپا ببوو. بیرورای ئەو لە بارەی
سیاسەتی جیهانیەوه تا ئاخری تەمەنی هەر لە پلەیەکدا ماوەوە. ئەو تا
سالی ١٩٢١ له هەموو مەسەلەکاندا کابرایەکی رەمەکی مام ناوەنجی بوو.
سالی ١٩٢١ تووشی نەخۆشی ئەفوستانی منداڵان بوو. پاش ئەم رووداوه
ناخۆشه زەخیرەی زانایەتی و کەسایەتی که له ئاخیدا شاردرا بۆوه؛ خۆی
دەر خست و کردی به باشترین سیاسەتمەداری ئەمریکا و فەرماندەیەکی
بەرزی شەڕ. بەڵام رۆزولت ئەو زانیاری و ئەزمونه قولەی نەبوو که وەک
سیاسەتمەدارێکی جیهانی بتوانێ بۆ سەر دەمی ئاشتی دوای شەڕ بەرنامه
دابرێژێ. ئەوە ئێمەین که هەر وا تاوانی بێ توانایی ئەو دەدەینەوە. به
بارەی ئەو ئوروپا ژاته سەرێک بوو تێکەڵ له چەند ئەتەوەی شەڕانی و
مەیدان خۆشکەری ئاگری شەڕ. ئەو پێش بینی دەکرد که دنیا بکەوێته ژێر
دەسەڵاتی دوو زلهێزی گەورەی سۆڤێت و ئەمریکاوە. هەر چەند خۆشی
دانی پیا دێنا که هیچ له رووسەکان تێناگات.

ئەو له وتو وێژەکانیدا له گەڵ ستالین له ئازاد کردنی کۆلۆنیەکانی
فەرانسه و بەریتانیا پشتیوانی دەکرد. بێ ئەوەی له بەر چاو بگری که
رووسەکان خۆیان به سەر گەوره ترین ئیمپراتوریەکانی جیهاندا حکومەت
دەکەن. به سەر ئەو سەر زەمینانه دا که کەوتوونه دەور وبەری رووسیا و
ئوقیانوسەکان لەتیان ئەکردوون.

رۆزولت کە بە روالەت لە چۆنیەتی دامەزرانی ئیمپراتوری رووسیا لە رابردوودا ناگادار نە بوو، نەیدەزانی کە سۆڤیێتیەکانیش سیاسەتی پەرە خوازی قەیسەرەکانیان کردۆتە سەر مەشقی خۆیان، واتە هەمان سیاسەتی رۆژ هەلات نیوە راستی قەیسەر کە بریتی بوو هەولدان بۆ دەست پێراگەیشتنی دالانەکانی داردانیل و بۆسفۆر و ناوەکانی گەرم لە کەنداوی فارس.

بە خۆشیەوە سیاسیەکانی دیکەی ئەمریکا لەو ئامانجەی سۆڤیێت ناگادار بوون. کاتی سەفەر بۆ تاران فرانکلین رۆزولت لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ناگادار نەکرا بوو. رەنگە هەر گوێشی نەدابێتە ئەو راپۆرتانەش کە بۆ موتالای ئەو ئامادە کرا بوون و یا هەر وا رەمەکی سەری کرد بن. ئەو زۆر جاران نارەزایی خۆی سەبارەت بە وەزارەتی کارو باری دەرەوە و سیاسەتی دەرەکی ئەو راگەیاند بوو. بەلام ئەو کەسانەی لەم وەزارەتخانەیە دا بەر پرسی کاروباری ئێران بوون ئەم جارە بە پشتیوانی (باتریک هرلی ) لە بەشی سیاسەتی دەرەوە کە جێگای بروای رۆزولت بوو هەولیاندا تا سەر کەوتن لە کۆنفرانسی تاران بەیاننامەیەکیش سەبارەت بە چارە نووسی ئێران بگونجێنرێت. دەقی ئەم بەیاننامەیە لە لایەن ( جگ جرنگان )ی دۆستم کە پێشتر لە وەزارەتی دەرەوەدا سەرۆکی بەشی ئێران بوو . ئەو دەمیش دەبیری سێیەمی هەیئەتی ئەمریکا بوو لە ئێران، بە یارمەتی (هرلی) و پشتیوانی( ئاوریل هەریمن) بالیۆزی ئەمریکا لە مۆسکۆ ئامادە کرا بوو. ئەم بەیاننامەیە لە بەرنامەی کاری کۆبوونەوەی تەواو بوونی کۆنفرانس، واتە میوانداری شەوی هەوەلی دیسامبردا

-----

گونجێنرا.

بەیاننامەکە لە کاتێکا باسی سەر خەتی بڕیارەکانی دەکرد، سێ دەوڵەتی ڕووس و ئینگلیز و ئەمریکای پەیماندار دەکرد کە سەر بەخۆیی و دەسەڵاتی تەواویەتی ئەرزی ئێران بپارێزن و شەش مانگ دوای تەواو بوونی شەڕیش هێزەکانی خۆیان لە ئێران بەرنە دەرێ. سەرە ڕای ئەوە کە پێشتر سۆڤیێت پێشنیارێکی ئەوتۆی ڕەت کرد بۆوە، ستالین بێ ئیعتیراز بەیاننامەکەی ئیمزا کرد. هەر چۆنێک بێ ئەو لەو کۆنفرانسە دا بەرندە بوو. جگە لە وەش فرانکلین ڕۆزولت پێشنیاری لەنگەرگایێکی ئازادی کرد بوو لە کەنداوی فارس لە ژێر سەر پەرشتی زلهێزەکاندا بێ و بە هۆی ڕێگای ئاسنەوە بگاتە سۆڤیێت. تازە ئەم پەیمانداریەش بۆ هەڵوەشانەوە دەبوو هەر وەک پەیمانەکانی دیکە کە دوای شەڕ لە لایەن سۆڤیێتەوە خرانە ژێر پێ تەنیا لە بەر ئەوە کە لە بەرژەوەندی سۆڤیێت نەبوون.

* * * *

کاتیکی سەربازانی سۆڤیێت بۆ هەوەڵین جار ساڵی ۱۹٤۱ هاتنە ئێران ئەوەندەیان حەز لێ نەبوو کە دەسەڵاتی سیاسی بە سەر ناوچەی ژێر دەستیاندا بسەپێنن. تەنانەت هێزیان نەدەبردە هەموو شارەکانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتیان. کاری ئەزم و تەرتیبی شارەکانیان بە کار بەدەستانی ئێرانی ئەسپارد و جگە لە وەش ڕیکایاندا ۱۵۰۰ سەربازی ئێرانی دوو بارە بگەڕێنەوە ناوشاری ژێر دەسەڵاتی ڕووسەکان. بەڵام دوای سەر کەوتنی شەڕی ستالینگراد ساڵی ۱۹٤۲ سەر دەمی ئەو خۆ گێل کردنە کۆتایی هات. لەو کاتەوە ئەخشەی پەلامارێکی سیاسی دوو قۆناخیان کیشا.

قۆناخی یێکەم ئامانجیان جیا کردنەوەی ئازەربایجان بوو لە ئێران ئەوەش لە رێگای دامەزراندنی رژێمێکی کۆمونیستی خود موختاری کە پاشان بیلکێنن بە خاکی سۆڤیێتەوە.

قۆناخی دووەم ئامانجی بەرز خوازی ئەویش قوت دانی تەواوی ئێران بە کەلک وەر گرتن لە چەکی حیزبی تودەی ئێران. حیزبی تودە ژانویەی سالی ۱۹٤۲ دامەزرا. واتە دوای هاتنە دەری رێبەرانی کۆمونیستی کە رەزاشا گرتبوونی. تێکۆشانی حیزبی تودە رۆژ بە رۆژ زیادی کرد و بە پشتیوانی سۆڤیێت دوای سەر کەوتنی ستالینگراد پەرەی پێدا. بە تایبەت لە ئازەربایجان لەو شوێنەی کە کاندیدای حیزبی تودە بە پشتیوانی سۆڤیێت توانیبوویان هەشت کورسی مەجلیسی ئێران لە هەلبژاردنی سالی ۱۹٤۳ دا وەدەست بێنن. لە سپتامبری ۱۹٤٤ یێکێتی سۆڤیێت بە ناردنی یاریدە دەری وەزارەتی دەرەوە ( سێرگی کافتارادزە ) کەوتە کار بۆ وتو وێژ لە بارەی ئیمتیازی ئەوتی شیمال نفوزی خۆی لە ئێران پەرە پێبدات.

دەولەتی ساعید کە لە مانگی ئوکتوبر بریاری دابوو تا کۆتایی شەر دانی ئیمتیازی ئەوت رابگرێ دژی داخوازی سۆڤیێت وێستا.

کافتارادزە لەم بوارەدا بە ئاشکرا هەرەشەی لە دەولەتی ساعید کرد. رووسەکان بۆ ساز کردنی خۆ پێشاندان یارمەتی حیزبی تودەیان دا.هەر چەندە دەولەتی ئێران لە سەر بریاری خۆی راوەستا، بەلام سۆڤیێت توانی لە وەلانانی ساعید دا نە ئەشی بنچینەیی یاری بکات. ساعید لە سەرۆک وەزیری وەلا نرا کەسێکی دیکەی بێ خاسیەت هاتە جێی ئەو. هەر لەو کاتەشدا تاقمی موخالیفی سۆڤیێت و حیزبی تودە لە دەوری سەید

زیانەددینی تەنها تەبایی کۆ بوونەوە کە پاش ٢٣ سال تازە لە دوور خستنەوە گەرا بۆوە.

رۆژی سەر کەوتنی هاو پەیمانان لە ئورووپا هەشتی مانگی مای ١٩٤٥ کاتێ کە من هێشتا لە بەغدا بووم بە مانای رۆژی کۆتایی شەڕ نیە لە ئورووپا، بەڵکوو ئەمە رۆژی سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ساردە.

* * * *

رۆژی ١٩ی مانگی مای کاتێ کە شای ئێران بە ناردنی یاد داشتێک بۆ ئینگلیز و ئەمریکا و سۆڤیێت داوای چونە دەری هیزەکانی کرد لە ئێران، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا تەنانەت پێش ئەم یاد داشتەش خەریک بووهێزەکانی خۆی لە ئێرلن بەرێتە دەر. مەئمووریەتی ٣٠ هەزار سەر بازی ئەمریکایی بریتی بوو لە پاراستنی شەقامە رێی ژیانی سۆڤیێتی و بار کردنی چوار میلیون تۆن کەل و پەلی ئەمریکایی بۆ ئەم وڵاتە گەمارۆ دراوە ، دوای کردنەوەی دالانی داردانیل و بۆسفۆڕ لە ئاخری سالی١٩٤٤دا ئیتر مانەوەیان بە پێویست نەزانرا. رۆژی هەوەڵی مانگی یونی ١٩٤٥ فەرماندەیی ئەمریکا لە کەندلوی فارس تێکۆشانی خۆی کۆتایی پێهێنا.

وەلامی ئینگلیزەکان بە یاد داشتی شا ئەوە بوو کە وردە وردە سەر بازانی ئینگلیزی و رووسی لە ئێران دەچنە دەرێ. بەلام رووسەکان لە بە جێ گەیاندنی بەڵێنەکەیان خۆیان بوارد. لە بەیاننامەی کۆنفرانسی پۆتسدام ( یول - ئوت ١٩٤٥ ) هەر باسی ئەو مەسەلەیەش نەکرا. بەلام ئینگلیزەکان یەک لایەنە بردنە دەری هێزەکانیان لە خوارووی ئێران دەست پێکرد.

لەم ناوەدا رووسەکان لە رۆژ هەلاتی نێوە راست، سیاسەتیکی قەیسەریان پێرەوی دەکرد. واتە گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان. لە کاتی شەڕدا بە بوونی دەولەتەکانی ئێران و تورکیا رێگای گەیشتن بەو ئامانجە گیرا بوو. بەلام ئێستا ئێران بە چوونە دەری هێزەکانی بەریتانی لە خواروو، بێ دیفاع مابۆوە. قەبارەی تورکیاش لە شەڕدا لاواز ببوو. هەر چەندە تورکیا بێ لایەن مابۆوە. بەلێ، ئێستا ئێران تەنیا بوو. کۆنترۆلی تەواوی سنورەکانی سەروو رۆژ هەلاتی ئەم ولاتە لە ژێر دەسەلاتی ئۆردوی سوور دابوو.

رووسەکان جگە لە نەخشەیان بۆ دالانی داردانیل، خۆیان لە وەر گرتنەوەی ناوچەکانی( قارس و ئەردەهان)یش خۆش کرد بوو کە سالی ١٨٧٨ تورک خستبوویانە ژێر دەستی خۆیان.

رووسەکان دەیانویست چۆن لە سنوورەکانی رۆژ هەلات بە توند وتیژی بزوتبوونەوە، لێرەش بۆ ئەستاندنەوەی ئەو سەر زەمینانەی لە ئیمپراتوری رووسیا جیا کرا بوونەوە دەست بە کار بن. بە تایبەت کە ستالین و سەرۆکی پۆلیسی ئەو (لاورینتی بیریا) هەر تکیان خەلکی گورجستان بوون و حەزیان دەکرد هەموو شارەکانی گورجستان بستێننەوە.

مانگی مارسی ١٩٤٥ مۆلۆتۆف بە ناردنی یاد داشتێک بۆ تورکەکان پەیمانی ٢٠ سالەی دۆستایەتی نێوان دوو ولاتی هەلوەشاندەوە. لە حەوتی مانگی یون ڕایگەیاند کە نرخی بە پەیمانێکی دۆستایەتی تازە، بریتی یە لە پێدا چوونەوە بە نێوەرۆکی پەیمانی (مۆنترۆ) سەبارەت بە داردانیل و بۆسفۆر. بەم جۆرە کە پێگەی رووس لە داردانیل و بۆسفۆر

دابمەزرێن و ( قارس و ئەردەهان)یش بدرێنەوە بەم وڵاتە.

بە دوای ئەوەدا لە حەوتی ئوت لە یاد داشتێکدا پەیمانی (مۆنترۆ)یان هەڵوەشاندەوە و داوایان کرد کە(تراسی) رۆژ ئاوا بدرێتەوە بە بولغارستان. تەنیا پێش شەڕی یێکەمی دنیا گر بۆ ماوەیەکی کەم ئەم ناوچەیە لەژێر دەستی برلغار دابوو.

تورکەکان دارێک نە بوون بەو بایانە بلەرزن. رووسیش دەیانزانی ئەگەر بیانەوێ ئەم نەخشەیە ئەنجام بدەن، دەبێ توشی شەڕێکی خوێناوی بن. رێگای هاسانتر بۆ ئاوی گەرم بە ئێراندا تێدەپەڕی. ئەیالەتی سەرووی رۆژ ئاوا واتە ئازەربایجان لە بەر دەستی سەر بازانی رووس دابوو. ئازەربایجان کلیلی کردنەوەی دەروازەی ناوچەکانی دیکەی ئێران و رەنگە تورکیاش بوو.

ماوەیەکی کورت دوای تەواو بوونی شەڕ سۆڤیێت دەستیکرد بە تاقیکردنەوەی ئەم کلیلە.ئەگەر ئەمریکا نەدەبوو بە کۆسپی سەر رێگایان، کاری رووس زۆر هاسان دەبوو. بەڵام وڵاتە یەکگرتودکانی ئەمریکا تازە لە خەوی شیرینی رۆزولت لە مەڕ هاوکاری دۆستایەتی لە گەڵ رووسان وەخەبەر دەهات. لە کاتێکا کە پریزیدێنت ترومن خەریکی مەسەلەی گیر وگرفتی دەورەی گواستنەوە بوو، هێشتا نەیدەتوانی بۆ لغاو کردنی پەرە خوازی رووسان سیاسەتی تازە نیشان بدات بەشی کارو باری رۆژ هەڵاتی نێوە راستی وەزارەتی دەرەوە سەبارەت بە رووداوەکانی ئێران و تورکیا بێ لایەن نەبوو.

## قەیرانی ئازەربایجان.

قەیرانی ئازەربایجان هەوەڵین پەردە بوو لە هەوەڵین شانۆگەری ( شەڕی سارد). من بە خۆشیەوە توانیم لە نێو یاریکەرانی ئەم درامە پڕ هەرایەدا نەخشێکی بچوک یاری بکەم. کاتێ لە بەغدا بووم وەک تەماشاچی شاهیدی دەستپێکی ئەم شانۆیە بووم. لەو ڕۆژانەدا نیکەرانی لە ڕووداوەکانی ئازەربایجان ببوە هۆی ئەوە کە ئینگلیزەکان شێوەی ڕەفتاریان لە گەڵ کوردەکان بگۆڕن.

ڕۆژی دووی سپتامبری ۱۹٤٥ و دوو حەوتوو دوای سەرکەوتنی هاو پەیمانان لە ژاپون شای ئێران پشت بەستن بە بەڵێن و پەیمانی ڕێبەرانی سێ دەوڵەتی ڕووس و ئینگلیز و ئەمریکا سەبارەت بە چوونە دەری هێزەکانیان لە ئێران داوا ی کرد بوو کە بەڵێنی خۆیان بەرنە سەر. بەڵام ڕووسەکان وەلامێکی ئەو تۆیان نە دابۆوە و بە هێشتنەوەی هێزەکانیان لە ئێران ئامانجی ڕاستە قینەی خۆیان ئاشکرا کرد بوو.

ئەیالەتی ئازەربایجان کرا بوو بە هەوەڵین قۆناخی گەلاڵەی بەرنامە ڕێژی پەرە گرتنی کۆمونیستی. بۆ گەیشتن بەم قۆناخە داگیر کەرانی ڕووسی دەستیان کرد بە دامەزراندن و بە هێز کردنی حیزبی کۆمونیست.

حیزبێک کە زۆربەی ئەندامەکانی لەو موهاجیرانە بوون کە سالی ۱۹۳٦ لە بەر بە روالەت پاک کردنەوەی ستالینی رایان کرد بوو لە ئازەربایجانی سۆڤیێتەوە هاتبوونە ئێران. ئەم موهاجیرانە هەموو چوبوونە نێو حیزبی تودەی ئازەربایجان کە پێشەوەری یەکێ لە کۆمونیستەکانی قەدیم رێبەریان بوو. پێشەوەری هەر چەندە لە ئێران هاتبوە دنیاوە بەلام زۆربەی تەمەنی لە باکۆ ئازەربایجانی سۆڤیێت رابوارد بوو. سالی ۱۹۲۰ لە دەولەتی تەمەن کورتی کۆماری گێلاندا کە لە لایەن سۆڤیێتەوە پشتیوانی لێدەکرا، بەشداری کرد بوو. پاشان سالی ۱۹۳٦ بە ناویکی ساختە وەک موهاجیر سنوری پەڕاند بوو لە ئێران گیرا بوو تا سالی ۱۹٤۱ لە بەندیخانە دا بوو.

لە مانگی یولی ۱۹٤٥ ئە نداماني چەکداری حیزبی تودە بە شێوەی کاتی ساختمانەکانی دەولەتییان لە ئازەربایجان داگیر کرد. لە مانگی ئوتی ئەو سالەدا پێشەوەری بە فەرمانی سۆڤیێت ( حیزبی دێموکراتی ئازەربایجانی دامەزراند. ئەم حیزبە لەو ناوچەیە بوو بە جێ نشینی حیزبی تودە. لە نیوەی مانگی نوامبر بەو چەکانەی لە ئۆردووی سووری وەرگرتبوو دەستی کرد بە چەکدار کردنی خەلک کە زۆربەیان لەو موهاجیرانە بوون. ئەم کۆمەلە شەڕوانەیان ناو نا ( فیدایی ). بە هیزی فیدایی و بە یارمەتی ئۆردوی سوور لە تەورێز ڕاپەڕی و رێگای هێزەکانی دەولەتی گرت و پادگانی تەورێزی چەک کرد و پاشان بە پێکهێنانی ( مەجلیسی میللی ئازەربایجان ) خود موختاری ئەم ئوستانەی راگەیاند.

بالیوزی ئەمریکا لە تاران (والاس مۆری ) کە راپۆرتی وشیار کەرەوەی خۆی بۆ واشنگتۆن نارد بوو، بە راسپاردەی لوی هندرسن و جیمز

برینز وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بە ناردنی یاد داشتێک بۆ مۆلۆتۆف وەزیری دەرەوەی سۆڤیێت لە ئاست ئەم کارانەی سۆڤیێت ئیعتیرازی کرد ولە سەر ئەنجامی ڕێک کەوتنی چونە دەری هیزەکان لە ئێران پێی داگرت. بەڵام ڕووسەکان لە گەڵ ئاماژە بۆ قەرار دادی ۱۹۲۱ی ئێران و سۆڤیێت وەڵامێکی لابەلایان دایەوە. پاش ئەم وەڵامە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و ئینگلیز لە ئاخری مانگی دیسامبردا بۆ چارە سەر کردنی مەسەلەکانی جێگای ناکۆکی چونە مۆسکۆ. بەڵام ڕووسەکان نەک هەر تەقەلای ئەوانیان بۆ باسکردن لە بارەی ئێران کردەوە هیچ، بەڵکوو هاندان لە تورکیا و چالاکیان لە ئێران پەرە پێدا. هەواڵدەری تاس بە بڵاو کردنەوەی راپۆرتێک باسی ویستی خەڵکی گورجستانی کرد بۆ گێڕانەوەی بەشێکی بەرین لە سەرووی ڕۆژ هەڵاتی تورکیا، لەوانە لەنگەر گای ترابزونیش لە دەریای ڕەش.

دێموکراتەکانی ئازەربایجان بە یارمەتی سۆڤیێت شەوی جێژنی کریسمس رە زائیەیان لە دەست ئاخرین پادگانی ئێران هێنا دەر و گرتیان. ڕۆژی کریسمس هندرسۆن وریایی دا بە (دین ئاچسۆن )جێگری وەزارەتی دەرەوە کە کردەوەکانی سۆڤیێت لە ئێران هەرەشە لە ئاشتی جیهان دەکەن. پریزیدێنت ترۆمنیش لە دژکردەوەیەکی توند دا رایگەیاند کە ئەمریکا لە مەو دوا لە بەرانبەر سۆڤیێت دا، دانانوێنێ. زەمینەی بەرەنگار بوونی دوو زلهێز ئامادە کرا بوو. ئەمریکا لە تەقەلای حوسێنی عەلا نوێنەری ئازای ئێران لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان پشتیوانی کرد. عەلا هەوڵیدا کە کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕازی بکات پەلاماری سۆڤیێت مەحکوم

بکات و بۆ چونە دەری هێزەکانی سۆڤیێت لە ئێران دەنگ بدات. بەڵام ڕووسەکان بە ئامادە کردنی هۆکاری کەوتنی دەوڵەت لە مانگی ژانویە و هاتنە سەر کاری قەوامو سەڵتەنە تەقەلای عەلایان کردەوە هیچ.

قەوام کە لە ناوچەی ژێر نفوزی ڕووسەکاندا ملکی هەبوو، لە ڕابردووشدا لە وانەیە بە حوکمی بیری بەرژەوەندی و لە بەر چاو گرتنی بار ودۆخی زەمانە لە ( بەرەی ئازادی ) سەر بە حیزبی تودە پشتیوانی کرد بوو. قەوام لە سەر ئەو باوەرە بوو کە ڕووسەکان دەبێ ڕازی ڕابگیرێن. چونکە ئەم سیاسەتە بۆ هاندانیان بۆ بردنە دەری هێزەکانیان لە ئێران کاریگەر تر دەبێ. هەر بەو دەلیلەش لە هەوڵ و تەقەلای حوسێنی عەلا لە کۆڕی نەتەوە نەککگرتوەکان پشتیوانی نەکرد.

قەوام ڕۆژی ١٩ی فیوریە بۆ وتو وێژ و ڕێک کەوتن لە گەڵ سۆڤیێت چوە مۆسکۆ. بەڵام دیار بوو کاتێکی شیاوی بۆ سەفەرەکەی هەڵنەبژارد بوو. چونکە ستالین ماوەیەک بوو باسی ( گەمارۆ دانی ) سۆڤیێتی دەست پێکرد بوو.بە گوێرەی پەیمانی ١٩٢١ قسەی لە مافی خۆی دەکرد بۆ دەست تێوەردانی ئێران. هەر بە گوێرەی ئەو سیاسەتە بوو لە وەڵامی قەوام دا ڕایگەیاند کە نێوە ڕۆکی پەیمانەکە مانەوەی هێزەکانی سۆڤیێت لە ئێراندا بە باشی ڕوون دەکاتەوە.

قەوام لەو سەفەرەدا نەیتوانی بیروڕای ستالین لە بارەی پەیمانەکە و یا لانی کەم لە بارەی ئازەربایجانەوە بگۆڕێ. بەڵام ڕووسەکان موافەقەتیان کرد کە هێزەکانیان لە شارەکانی خوارووی دەریای خەزەر و لە سنورەکانی ڕۆژ هەڵات بەرنە دەر و بەشێکیش لە ئوستانی ئازەربایجان وەک

نوستانێکی خود موختار بگەڕێتەوە بۆ ئێران.

بەم چەشنە ڕۆژی دووی مانگی مارس - واتە مێژووی دیاریکراوی چونە دەری هێزی هاو پەیمانان لە ئێران بە گوێرەی بەیاننامەی سێ قۆڵی ١٩٤٢ گەیشتێ، بەڵام هێزەکانی سۆڤێت هێشتا هەر لە ئازەربایجان دا مابوونەوە.

موزەفەر فیروز وتە وێژی ڕەسمی قەوام بە نەددبانە ئەم ڕەفتارەی سۆفێتی بە (ژێستێکی دۆستانە) ناو برد. ڕۆژی دوایی محەمەد موسەدیق ڕێبەری ناسیونالیستەکان لە پارلمانی ئێران زۆر بە توندی ڕەخنەی لێ گرت.

ئەم هەرەکەتەی سۆفێت و کردەوەکانی دیکەی بوون بە ئیلهام بەخشی وینستۆن چرچیل بۆ وتارە مێژوویيەکەی ڕۆژی پێنجی مارس لە فۆلتون میسوری . ئەو لە قسەکانیدا ئاماژەی بۆ پەردەیەکی ئاسن کرد کە بە نێوە ڕاستی ئورووپادا کێشراوە. هەر لەو کاتەدا ئەو ئورووپاییەکانی وریا دەکردەوە کە ئەو مەترسیە تازەیە هەرەشە لەو ئازادیە دەکات کە ئەو هەموو خوێنەی بۆ ڕژاوە، نیشانەی شومی پەلامارێکی ڕاستە قینە لە ئازەربایجان دەبینرا. لە ڕۆژی وتار دانەکەی چرچێل دا ( رابرت ڕۆسۆ )یاریدە دەری کونسولی ئەمریکا لە تەورێز لە ڕاپۆرتێکدا ڕایگەیاند کە ئامادەیی هێزی نیزامی سۆڤێت نیشانەی پەلامارێکە بۆ سنوردکانی ڕۆژ هەڵاتی تورکیا.

لێرەدا ئارچیبالد چەند لاپەردیەک دەچێتە سەر باسی چۆنیەتی بارودۆزی مەئموردکانی بالیوزخانەی ئەمریکا و شەقامەکانی تاران و

جێگاو شوێنی بالیوز خانه و مەئمور و کار م هەڵسورانیان کە بۆ باسەکەی ئێمە ئەوەندە سەرنج راکێش نیە. بە ئیجازەی خوێنەرانی بە رێز بە سەریاندا بازد دەدەم و لەو لاتر لە سەر خەتی باسە ئەسڵیەکەمان پێنوسەکەم دەگیرسێنمەوە . - وەر گێڕ

کوردەکان

بەر لەوەی چارە نووس کاری دوا رۆژم دیاری بکا، بەشێک لە ئەرکی من لە تاران لە سەرەتای دەسپێکی سەر دەمی شەڕی سارد و ئاخرین رۆژەکانی ژیانم لە تاران توشی کۆتاییێکی خەفەتاوی بوو. ئەوەش پێوەندی هەیە بەو پێوەند یانەوە کە کاتی دانیشتنم لە بەغدا لە گەڵ کوردەکان دام مەزراند بوو.

ئەگەر لە بیرتان بێ کاتێکی لە بەغدا بووم بڕیارم دا بە مەسەلەی عەرەبانەوە، بە تایبەت تایفە گەلی عەرەبەوە خەریک بم. چونکە ئەوەی پێش من لە وێ بوو لێکۆلینەوەیەکی گشتی لە سەر کوردەکان -سەر بزێویترین دەستەی ئەو کاتی ناوچە - ئەنجام دابوو.

بەڵام رەوەندی کارەسات لە عیراق و ناوچە سنورەکانی نێوان عیراق و ئێران گرنگی مەسەلەی کوردەکانی زیاد کرد و بە حوکمی پێویست سەرنجی منی بۆ مەسەلەکانی ئاگاداری ئەو قەومە راکێشا. لە بەر ئەوە لە سەرەتای هاوینی ١٩٤٥ بخوازی یا نە خواز توشی مەسەلەی کوردان بووم.

لەم جیهانە دا کەمتر شوێنی واهەیە کە وەک کوردستان سەرنجی بینەر بۆ لای خۆ رابکێشێ. چیاکانی نارێکی ئەم ناوچەیە کە لە شوێنێ رووتەن و وشکن و لە جێگایەکی دیکە بە دار مازوی کورت وکاج داپۆشراون، جار

وبار دۆڵی بەرین لێکی دابڕیون و تا چاو هەتەر دەکا لە هەموو قوژبنێکی ئەو دۆڵە خانووی خشتی و بەردی کوردەکان بڵاو بوونەوە.

من بۆ هەوەڵین جار پێش چل ساڵ چومە گوندێکی کوردان کە لە سەرەو ژێری چیا دروست کرا بوو دەیڕوانیە دۆڵێکی قووڵ. بە زەحمەت دەکرا جۆگەلە ئاوێکی زێوین لە خوارەوەی دۆڵەکە ببینی کە بەرەو دەشتایی دەڕۆیشت. لام وایە ئەو یاد داشتانەی ئەو دەم لە بارەی ئەم گوندەی کوردی نووسیومن، ئێستاش لە بارەی زۆر لە گوندە کورد نشینەکانەوە راستە.

لیباسی گوندییەکان و ساختمانی خانوەکانیان بوو بە هۆی ئەوە کە هەست بکەم لە( شانگری )دام. پیاوەکانیان پێچێکی گەورەی رەنگاو رەنگیان لە سەرە. ریشێ زۆر باریک بە سەر ناو چاویاندا هاتۆتە خوار. سوخمەیەکیان لە بەر دایە کە راست و چەپ فیشەکدانیان بە سەر دا هێناوە. قاوغی فیشەکەکان لە بەر تیشکی خۆرە تاو دەدرەوشێن. پشتێندی درێژ و پان کە لە چەند مەتر پارچەی رەنگاو رەنگ ساز کراوە، لە پشتیان دەهاڵێن و پانتۆڵی فرەوان و قاوەیی رەنگیان رادەگرێ. ئەو پشتێندە جێگای گیرفانیش دەگرێ. پیاوەکان زۆربەیان خەنجەری چەماوە وکیسە قایشی تایبەتی پارە ویا توتن و قەننەی درێژ دەبەر پشتیان رادەکەن. قەننەی گڵی سوور کراوەوە بە لێویانەوەیە و مژی لێ دەدەن.

ژنەکان لیباسیان بە چاو لە پیاوان کەمتر نیە. تەواوی چیا نشینەکان بە لەنجەو فیزەوە هەنگاو دلوێن. لە کاتێکا بالایان راست و پتەو راگرتوە، کۆزەی ئاو لە بان سەریان دادەنێن و دەڕۆن. سەر پێچی ئەوانیش رەنگی

ئاوبە.

ژیانی گوندی یەکانی کورد ژیانێکی دژوارە. ئەوانەی خەریکی کشت وکاڵن دەبێ هەمیشە لە گەڵ زەوی وشک و بەردەڵان دەست بە کار بن. دەبێ لە رێبازی جۆگەلەی کەم ئاو کە لە چیا دێتە خوارێ ئاو بەند ساز بکەن. لە هەموو دڵۆپە ئاوێک بۆ ئاو دانی سپیندار وداری بەری و مەزرای چەڵتوک و توتن کە بەرهەمی گرنگی ئەو هەرێمەیە کەڵک وەر گرن. ئەوان بە ئاموری ئەستوری دار ناچارن لە پەنا خڕ و دۆڵان پارچە زەوی لێژ بۆ دێمە کار بکێڵن. لە زەوی رۆخی چۆمەکان کە بارانی زستانی تۆزێ نمی داوەتێ، گەنم و جۆ بچێنن.

ژیانی ئەوانی دیکە لە وەرزێرانیش سەختترە. مەبەستم کۆڵ نشینی گەڕۆکن کی رەشماڵ هەڵدەگرن و لە هاوینێ بە دوای مێگەلدا لە کانی و ئاوی سارد و لەوەڕگا دەگەڕێن. لە پایزیشدا لە ترسی بەفر و باران پەنا بۆ دۆڵ و خڕە قوولەکان دەبەنەوە. ئێستا ئیتر زۆربەی ئەو گەڕۆکانە نیشتە جێکراون. ئەوانەی نووسیومن دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٥.

کوردەکان بە ئەسڵ ئێرانین و بەر لە دوو هەزار ساڵ لە سەر زەمینی ئێستایاندا ژیاون. هەر چەند ئەوەی لە نووسراوەکانی خەتی بزماری کەونارا لە بارەی کوردەکانەوە ئاماژەی بۆ کراوە جێگای باسە. بەڵام رەنگە جێگای گومان نەبێ کە ئەم کوردانە هەر هەمان (کوردۆخواهایی)ن کە سەردار و مێژوو نووسی یونانی ( گزنفۆن) لە باردی پەلاماری کوشتدیان بۆ سەر هێزەکانی دە هەزار کەسی یونانی کاتی تێپەڕ بوونیان

بۆ لای دەریای رەش باسێکی درێژی هەیە.

رۆمی یەکانیش لە گیرو گرفت و بەرەنگاری ئەم ناوچەیە کە ئەو دەم (کوردەوان)یان پێگوتون لە ئەماندا نەبوون. لە سەدەی حەوتەمی زایینی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە مسلمان بوون. لە گەڵ تەواوی ئەو سیفەتانە بە درێژایی مێژووی ئەو قەومە تەنیا کوردێک بە ناوی ( سەلاحەدین) توانی پاشایەتی دابمەزرێنێ. ئەوە هەر ئەو کەسەیە کە کوردەکانی ئەمڕۆ بە فیز و شانازیەوە وەک ئەجاتدەری ئیسلام باسی دەکەن. هەر ئەو بوو کە شەڕ کەرە خاچپە رستەکانی لە بەیتولموقەددەس و بە گشتی لە رۆژ هەلاتی نێوە راست وەدەر نا.لە کتێبەکانی مێژوویی عەرەبی و فەرەنسیدا لە سەر رەشیدی و جوامێری ئەو چیرۆک نووسراون. هەر ئەو سیفەتانەی کە هێشتا بە سیفەتی هێندێ رێبەرانی کورد دادەنرێن.

سەدەی ١٣ ئەم سەر زەمینە بوو بە مەیدانی ململانی ئیمپراتورەکانی تورک و ئێرانی کە دوژمنی یەکتر بوون. تا لە ئاخرەکەیدا سولتان مرادی چوارەم و شا سەفی پاشای ئێران کوردستانیان لە نێو خۆدا بەشکرد. ئەو سنورانەیان دانا کە ئیمرۆش هەر هەن.

تا سەدەی رابردوو ناسیونالیزم بە واتای ئیمرۆ نەبوو. کوردەکانیش خۆیان بە نەتەوەی جیاواز نەدەزانی. لە دەیەی ١٨٣٠کاتێ کە یەکێ لە رێبەرانی کورد بە ناوی ( بەدر خان) تورکی لە ناوچە کورد نشینەکان وەدەر نا و خۆی - هەر چەند بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ - حکومەتی دامەزراند، ناسیونالیزمی کوردیش لە دایک بوو. بە درێژایی شەڕی ئێکەمی دنیا گریش(سەید تەهای شەمزینی) کە رێبەرێکی ئایینی بوو، رێگای

بەدرخانی درێژە پێدا. *بەڵام راپەرینی کوردەکان لە جێگەرای ناسیونالیزمی کورد واتا تورکیا، بە شێوەی هەرە سەخت سەر کوت کرا. چونکە مەکتەبی پانتارکیزم کە مستەفا کەماڵ داینا بوو ئیتر جێگای بۆ خۆ دەر خستنی نەتەوەکانی دیکە نەدەهێشتەوە.

لە ئێران عەشیرەتەکانی کورد لە پەنا پاشاکانی قاجاردا ژیانی جۆرە سەر بەخۆییان درێژە پێدەدا. تا شەڕی یێکەمی دنیا گر واتا کاتێ کە بەشی سەرووی رۆژ ئاوای ئێران بوو بە مەیدانی تاڵان وبڕۆی لەشکری رووس و تورک. کوردەکان لە هێندێ ناوچە لە بەر پەلاماری لەشکری رووس توشی زیان و وێرانی بوون. تا ئێران بوو بە خاوەنی رێبەرێکی تازە بە ناوی رەزا شا کە خەریک بوو وڵات بە شێوەی یەک ناوەندی بە رێوە بەرێ و حکومەتی ناوچەیی و خانخانی و سەرۆک عەشیرەتی کۆتایی پێ بێنێ. شەخسی سمکۆ رێبەری قەومی کورد لە سەرووی لیستەیەک بوو کە رەزا شا بۆ لەناو بردنی باسکی هەڵماڵیبوو. ساڵی ١٩٢٢ لەشکری ئێران بارەگای سمکۆی پەلامار دا و ناچاری کرد لە وڵات دەر کەوێ. ئەو لە ئێران رایکرد و بە سلامەتی دەرکەوت. بەڵام ساڵی ١٩٣٠ وەک ئەحمەقان داوەتی گەڕانەوەی قەبوڵ کرد و هاتەوە ئێران. گەڕانەوە و کوشتنی یەک بوو.

زۆری دیکە لە سەرۆکانی کورد چارە نووسی سمکۆیان هەبوو. هێندێ لەو رێبەرانە لە وڵات رایان کرد.هێندێکی دیکە بە فەرمانی رەزاشا کوژران.هێندێ لە خۆشبەختیان لە تاران نیشتە جێ کران.ساڵی ١٩٢٥ تەواوی کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی. دەوڵەت لە

گەڵ بڵاو کردنی دەستەی چەکداری تایفەکان، عێلە گەڕۆکەکانی مەجبور کرد کە نیشتە جێ بن.

بەڵام لە عیراق وەزعی ٦٥٠ هەزار کوردی ناوچەی سەرووی رۆژ هەڵاتی ئەم وڵاتە لە گەڵ وەزعی کوردەکانی ئێران فەرقی هەبوو. سالی ١٩٣٢ کاتێ کە عیراق وەک وڵاتێکی سەر بەخۆ بە رەسمی ناسرا و بوو بە ئەندامی (کۆمەڵی نەتەوەکان) لە بەیاننامەیەکدا بۆ شورای کۆمەڵ بەڵێنی دا کە زمانی کوردی وەک زمانی ڕەسمی لە ناوچەی کوردی بە رەسمی بناسێ و مەئمورەکانی کورد و یا کورد زمان لەم ناوچەیەدا خزمەت بکەن. هەر چەند عیراقیەکان بەڵێنی خۆیان بردە سەر، بەڵام دیسان کوردەکان رازی نەبوون. ئەوان ئیدیعایان دەکرد - دیارە تا رادەیێکیش هەقیان بوو - دەوڵەتی عیراق لە گەڵ کوردەکان فەرق و جیاوازی دادەنێ بە تایبەت لە دانانی قوتابخانە و خۆشکردنی جادەکان و ئیمکاناتی دەرمانی و یارمەتی کشت وکاڵی و... بە تایبەت لە بارەی بەرهەمی گرنگی کشت وکاڵ واتە توتن ئیعتیرازیان هەبوو چونکە مەجبور بوون، ئەم بەرهەمە بە دەوڵەت بفرۆشن و قازانجی سەرەکی ئەم بەرهەمە دەچوە گیرفانی بەرهەمهێنەرانی سیغار لە بەغدا و شارەکانی دیکە.

ئەم نارەزاییە وردە وردە وەک شۆرش و راپەرینی جیاواز خۆی دەنواند.هەوەڵین رێبەری کورد کە شۆرشی دەست پێکرد شێخ مەحمود ناوێک بوو لە رێبەرانی ئاینی و خەڵکی سولەیمانی. سولەیمانی کەوتۆتە سەرووی رۆژ هەڵاتی عیراق و ناوچەیەکی بە پیت وبەرەکەتە وشوێنی بەرهەمهێنانی توتنە. پاش ئەوەی ئینگلیز شێخ مەحمودی وەک

فەرمانداری ناوچە دیاری کرد دیسان رازی نەبوو. وردە وردە خۆی ناو نا
ڕێبەری کوردستان.

ساڵی ١٩٣٢ئینگلیزەکان لە حکومەت وەلایان نا و ئەویش رایکرد بۆ
ئێران. بەڵام پاشان عافو کراو ڕێگایان دا بێتەوە عیراق بەو مەرجەی کە
لەگوندی خۆی دانیشێ و خەریکی کشتو کاڵ بێ و دەست لە سیاسەت وەر
نەدا. شێخ قەبوڵی کرد و تا کۆتایی تەمەنی بەڵێنی خۆی بردە سەر. هەر
وەک شێوەی کوردانە، کوردەکانی دانیشتوی ناوچە شاخاویەکانی سەروی
ڕۆژ هەڵاتی عیراق چاوە روان مانەوە تا شێخ مەحمود سەر کوت کرا، ئەو
دەم دەستەیەکی دیکە شۆرشیان دەست پەکرد. ریبەرایەتی راپەرینی
ئەمجار شیخ ئەحمەدی سەرۆکی عێلی پچوکی بارزان بوو. ئەو ڕێبەری
ئایینی بوو کە تایفەی خورافاتی بروایان پێبوو. گوێ ڕایەڵی بوون.
هێزەکانی ئینگلیزی کە بە گوێرەی ئیجازەی کۆمەڵی نەتەوەکان دوای
شەڕی یێکەمی دنیا گر لە عیراق جێگیر ببوون، بارزانیەکانیان سەر کوت
کرد و ئاخرەکەی برای گەنج و بە توانای شێخ ئەحمەد ( مەلا مستەفا ) بوو
بە ڕێبەر. هەر تک برا لە گەڵ پێرەوە وەفادارەکانیان بۆ خوارووی عیراق
دوور خرانەوە. ئاخرەکەی ساڵی ١٩٣٦ ڕێگایان پێدرا بگەڕێنەوە
کوردستان بەو مەرجەی لە سولەیمانی دابنیشن.

****

ڕۆژی ٢٥ی مانگی ئوتی ١٩٤١ لە گەڵ پەلاماری هێزەکانی رووس و
ئینگلیز بۆ ئێران، رووسەکان لە سەرووی ڕۆژئاوای ئێران جێگیر بوون و

تەنیا شاری ورمێ یان خستە ژێر کۆنترۆڵ. دەسەلاتی هێزەکانی ئینگلیزیش لە سنە تێ نەپەری. بەم چەشنە لە نێوانی دوو ناوچەی ژێر کۆنترۆلی رووس و ئینگلیز دا، سەر زەمینێکی ئازاد کراو لە دەورو بەری چیاکانی نێوان عیراق و ئێران مایەوە کە بوو بە مەیدانی هێز و دەسەلات نیشاندانی کوردەکان. هەر چەندە پۆلیسی ئێران لە شار و گوندەکانی ئەو ناوچەیەدا مابوونەوە، بەلام کوردەکان بە کەلک وەر گرتن لە تواناو دەسەلاتی خۆیان هێزی خۆیان زیاد کرد وورده ورده لە دەورو بەری شاری مەهاباد لە ناوچەیەکی لە چاو پان و بەرین، حکومەتێکی سەر بەخۆیان دامەزراند.

مەهاباد لە ئەسلدا ناوی ( ساپلاخ) بوە کە وادیارە وشەی تورکی یە و بە مانا ( کانی سارده ). راست مانای (COLD SPRIN )ی هەیە. ئەو شوێنەی سەر دەمی زارۆکی من لەوێ تێپەریوە. رەزاشا ناوی ئەو شارەی کردە مەهاباد. مەهاباد مانای شاری (ماد)ە کانە. لە سەر بنچینەی گریمانیی (مادی) بوونی بنە چەکەی کوردان لەم ناوە ذراوە بەم شارە.

دانیشتوانی مەهاباد نیزیک بە تەواو لە رەگەزی کورد بوون.لە کاتێکا ڤانیشتوانی شارەکانی دیکەی دەورو بەری گۆلی ورمێ تورکی ئازەربایجانی بوون. دانیشتوانی مەهاباد تاقمێک بوون کە وازیان کە گەرۆکی هینا بوو روویان کرد بوە شار. کەسایەتی بەر چاوی هەو جەماعەتە ( قازی محەممەد )بوو لە بنە مالەیەکی ئایینی.

قازی لە سەرەتاوە دەرسی ئایینی خوێند بوو. بەلام بابی لە بۆ

قەزاوەتی شەرعی پەروەردەی کرد بوو، کتێبخانەیەکی بە میرات بۆ بەجێ هێشتبوو کتێبی بە حەوت زمانان تێدا بوو. قازی بە کەلک وەر گرتن لەو کتێبجانەیە زانیاری خۆی لە بوارەکانی دیکە دا پەرە پێدا بوو. بەم بونەوە لە هەوەڵین ساڵەکانی چلەی ژیانی جگە لە پایەی قەزاوەتی شەرعی لە سایەی بیری پوختە و کەسایەتی بە توانای لە شاردا هەڵکەوتێکی شازی هەبوو.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ سۆڤیێتیەکان بە داوەت کردنی ٣٠ کەس لە کوردەکان بۆ باکۆ حەز و مەیلی خۆیان بە مەسەلەی کورد ئاشکرا کرد. نیزیکەی هەموو بانگ کراوەکان سەروک عیل و عەشیرەت بوون. قازی محەمەدیش بە نوێنەرایەتی شاری مەهاباد لە گەڵ ئەم کەسانە بوو. دەستەی داوەتکراو دوای سەردانی کارخانە و مەزراکان چونە لای ( جەعفەر باغر یۆف ) سەرۆک وەزیری کۆماری سۆسیالیستی ئازەربایجان. باغر یۆف هەر چەند باسی دۆستایەتی سۆفیێت و نەتەوەکانی پچوک و برایەتی کورد و ئازەربایجانی کرد، بەلام لە بارەی ئاڵو گۆڕی سیاسی ناوچە تەنیا بە ئاماژەی نادیار بەسیکرد. دوای گەڕانەوەی ئەم هەیئەتە رووسەکان نە چونەوە سەردانی کوردستان. رەنگە لە بەر ئەوەش بوو بێ کە هەموو بیر و کاریان زیاتر بە لای پەلاماردەرانی ئەڵمانی دابوو کە لە دەروازەی قەفقاز وە نیزیک کەوتبوون.

رەنگە ئەو چاو پێکەوتنە کوردەکانی بۆ تێکۆشانی پتری ناسیونالیستی بزواند بێ. لە سیپتامبری ساڵی ١٩٤٢ هێندێ لە هاو شاریانی مەهاباد چلویان بە سەرهەنگێکی ئەرتەشی عیراق کەوت بە ناوی

میر حاج. میر حاج نوێنەری ڕێکخراوێکی ناسیونالیستی کورد بوو بە ناوی هیوا کە تازە لە عیراق دامەزرا بوو. دوای هەو چاو پێکەوتنە کوردەکانی دانیشتوی ئێران بریاریان دا حیزبی ناسیونالیستی خۆیان دابمەزرێنن. ئاخرەکەی ( کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانیان ) دامەزراند.
وردە وردە ژمارەی ئەندامان و نفوزی لە نێو کوردەکانی ناوچەدا زیادی کرد.
لە مانگی مای سالی ۱۹٤۳ دەستەیەکی ناسیونالیستی کورد توانی پاسگەی پۆلیسی مەهاباد، واتە ئاخرین پێگەی دەسەلاتی دەولەتی ناوەندی لە مەهاباد تێک بروخێنێ.

لە ئاخری ساڵی ۱۹٤٤ قازی محەممەد هوانی بە یارمەتی برای گەنجتری ئەبولقاسمی سەدری قازی کە نوێنەری پارلمان بوو، لە گەڵ محەممەد حوسێنی سەیفی قازی ئامۆزای کە ئەفسەری پێشووی ژاندارمە بوو، کۆنترۆلی کۆمەڵە بگرێتە دەست.

سەر هەڵدانی ناسیونالیزمی کورد لە ئێران، لە عیراقیش بێ تەئسیر نە بوو. ساڵی ۱۹٤۳ مەلا مستەفا لە گەڵ هێندێ لە لایەنگرانی لە سولەیمانی -شوێنی نیشتە جێکردنی ئیجباری - رایکرد و چۆوە بارزان.
کەمێک دوای گەیشتنەوەی لە گەڵ کار بەدەستانی ناوچە کێشە دەست پێکرا. لە مانگی ئوکتۆبر دا هێزی مەلا مستەفا لە ۲۰۰ کەس تێ نەدەپەڕی. لەشەڕێکدا لە گەڵ پۆلیس سەر کەوت. پاش مانگێک واتە کاتێ ژمارەی لایەنگرانی زیادی کرد، مەلا مستەفا بریگادێکی ئەرتەشی تێک شکاند.

لەم قۆناخە دا بالیوزی ئینگلیز (کینا هان کورن والس) خۆی لە وەزع

هەڵقوتاند. ئەو لە سەرەتا دەورانی سەر پەرشتی ئینگلستان لە عیراق، واتا لە دەیەی ۱۹۲۰ نیزیکترین راوێژ کاری مەلیک فەیسەل بوو. لە کاروباری سیاسی عیراقدا خاوەنی بیر وئەزمون بوو. لە وتو وێژ لە گەڵ شێخ مەحمود دا ئەخشێکی بەر چاوی لە سولەیمانی یاری کرد بوو. لە رەوەندی ئەم وتو وێژانەدا ئەزمونێکی وەدەست هێنا بوو، وادیار بوو سەبارەت بە مەسەلەی کورد سەمپاتیەکی هەبوو. هەستی بە جۆرە هاو دەردیەک دەکرد. لەم قۆناخە دا ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لێ نەهاتویی سەرۆکەکانی عیراق بۆتە هۆی سەر هەڵدانی مەسەلەی مەلا مستەفا و پێویستە کوردەکان لە دەوڵەتی عیراقدا بەشدار بن.

ئاخری ساڵی ۱۹٤۳ نوری سەعید ی سەرۆک وەزیر لە کابینەی خۆیدا کوردێکی کردە وەزیر، بێ ئەوەی وەزارەتخانەی پێ بسپێرێ.هەر ئەم وەزیرە کوردە وای کرد کە مەلا مستەفا ۱۹٤٤ سەری بەغدا بدا.بەڵام نە چاو پێکەوتنی بەغدا و نەسەفەری نوری سەعید بۆ کوردستان فایدەیەکیان نەبوو. مەسەلەی لێ خۆشبونی راپەریوەکان، بە تایبەت ئەو مەئمورە ئەرتەشی و مەدەنیانەی کە رەگەل مەلا مستەفا کەوتبون، سەری نەگرت.
نوری سەعید کە لە دۆزینەوەی رێگا چارە نا هونێد بوو ،جارێ لە دەوڵەت کشایەوە. بە دوای ئەم مەسەلانەدا شەڕ وە ستانێکی لەرزۆک لە نێو ان کوردەکان و دەوڵەتی عیراقدا بەر قەرار بوو. لەم دەورەیە دابوو کە من گەیشتمە بەغدا ۱۹٤٤

لە بەغدا هەوڵم دا لەبارەی بارودۆخی کوردەکان ئاگاداری وەدوست بێنم. لەم رێگایەدا لە گەڵ ناوەندی (زیدی ئیتیلاعاتی) عیراق پێوەندیم

پەیدا کرد و خۆشم لە ڕێگای تایبەتیەوە خەریکی لێکۆلینەوە بووم.
پیوەندی تایبەتی خۆم هێند کوردی دانیشتوی بەغدای دەگرتەوە. یەکێ لەو کوردانە بابا عەلی کوری شێخ مەحمودی بوو، پیاوێکی خۆش تیپ و کۆمەلایەتی. یەکی تر ناوی (پوشۆ) بوو. ناوی ئەسلی محەمەد سادق و کوری سەید تەها بوو. سەید تەها یەکێ لە دۆستە باشەکانی ژەنراڵ(فردینان فوش)بوو.کاتی لەدایک بوونی (پوشۆ) سەبارەت بە دۆستایەتی لە گەڵ ژەنراڵ کورەکەی بە ناوی ئەو کرد بوو. کە لە زاری کوردی دا کرا بوە پوش و دوایەش پوشۆ.

پوشۆ کەسایەتێکی وریا و شادی هەبوو. من هەمو ڕۆژێ لە هوتێل ریجنت دەمبینی. کراسێکی سپی و پانتۆلێکی گوشادی لە بەر دەکرد و شاڵێکی لە پشتێ دەهالاند وکلاوێکی وەک لبادی لە سەر دەنا، پارچەیەکی وەک مێزەریشی لە دەورەی دەهالاند. ئەو لە ئاست عەرەبان بێزاری دەر دەبری و لە گەڵ مەلا مستەفا و کوردە ناسیونالیستەکانی دانیشتوی ئێرانیش لە پێوەندی دابوو. خزم و قەومی لە ئێرانێ دوژیان.

سێ یەمین کەسی پێوەندیم لە گەڵ پەیدا کرد بوو( ژەنراڵ بەهائەدین نوری ) نایب سەرۆکی پێشوی ستادی ئەرتەشی عیراق بوو. دوو حەوتو دوا ی گەیشتنم چاوم پێی کەوت. ئەو زەلامێکی بە سام بوو. ورگێکی زەلام و سمێلێکی شۆر. بە دوایی لە فەرمانداری سولەیمانی وەلا نرا بوو. دوکتور هۆف منی بردە لای ژەنراڵ نوری. خۆشی بۆ هاروژاندنی نوری دەستی پێکرد کە زمانی کوردی هیچ نیە تێکەلێکە لە زار و لە هجەی جۆر بە جۆر.

نوری لێی وەدەنگ هات و گوتی: (هیچ وانیە.زمانی کوردی زمانێکی سەر بە خۆیە) ئەو هێندێ رەسمی مندالی هەژار و شڕۆلی نیشاندایین. رەسمەکان هی پێشوو بوون و پاشان دەولەت لیباسی دابوونێ. ئەو دەیگوت: ژنێکی دیوە کە هیچچی نەبوە بیکاتە بەر و کاتێ ویستویە بچێیە دەر، بڕەی لە خۆ وەر پێچاوە. هەر وەها بۆی روون کردینەوە کە چۆن بۆ هاندانی دەولەتی ناوەندی بۆ دانانی بودجەیەک بۆ باشکردنی وەزعی گوندێکی دوور دەست و فەقیر هیلاک بوە و نەتیجە ی وەر نەگرتوە.

دوای سالێک لە ئوکتۆبری ١٩٤٥ لە گەل ئەفسەری پێوەندارم چومە ناوچەی سولەیمانی و لە نیزیکەوە چاوم پێکەوت. ئەفسەری پێوەنداری ناوچە( جیمز شوتر) یەک لە ئەفسەرانی سیاسی گەنج بوو. کوردەکان خۆشیان دەویست. ئەو لە کەرکوک رەگەل من کەوت و بڕیار بوو ماوەی سێ سەعات لە کەرکوکەوە تا سولەیمانی بە تروومبیل بڕۆین.

ئێمە لە رێگای کەلێکەوە گەیشتینە چیاکانی کوردستان. پاشان لە دەربەندی بازیان کە دۆلێکی قوولی نێوان بوو تێپەڕین. شوتر بناخەی ئەو حەسارانەی نیشاندام کە سالی ١٩١٩ شێخ مەحمود بۆ بەرگری لە لەشکری ئینگلیز دروستی کرد بوون.( دیارە بە ئاوات نە گەیشتبوو)

پاشان گەیشتینە مەزرای سەوزی توتن. تازە گەلا توتنیان لە دەرەوەی خانوەکانیان هەلاوەسیبوو تا وشک بن. کاتێ گەیشتینە سولەیمانی لە مالی (شۆتر) چەند ریش سپی کورد هاتنە لامان و لە بارەی بارودۆخی ناوچە گەلێک قسەی سیاسیان پێگوتین.

بەر لە هەموو شت دەنگۆیان بە مەسەلەی بەهانەدین دەستپێکرد. ئەوانیش پشتی قسەکانی بەهانەدینیان دەگرت و دەیانگوت: فەرماندارێکی تێکۆشەر و لێهاتوو بوو. پیلانگێرانی بەغدا لەسەر کاریان لابردوە. شۆتر و میوانەکانی فەرمانداری تابەیان بە مەئمورێکی باش نەدەزانی. دەیانگوت: رەفتاری ئەو مەئمورانە سالی ١٩٤٣ بۆتە هۆی راکردنی مەلا مستەفا.

لە گەرانی نێو شار و بازاری سولەیمانی کەوتمە ژێر تەئسیری روالەتی جوانی کوردان. زۆربەیان ریشیان هەبوو. شتێکی لە بەغدا بە جارێ ون ببوو. لیباسی جوانیان لە بەر دابوو. ئەوە لە هەموو شت زیاتر کاری لە من کرد قوتابخانەیەکی بچوک بوو لە نێو بازار کە ریش چەرموکێکی رێز دار خوێندنی بۆستانی سەعدی شاعیری فارسی زمانی فێری مندالانی ٩ سالە دەکرد. پاشان تێگەیشتم کە زمانی کولتوریی کوردەکانی عیراقیش وەک کوردەکانی ئێران فارسی یە. رەنگە ئەم نمونەیە بەس بێ بۆ ئەم بیرورایە کە ئەدەبیات و تەنانەت زمانی فارسی سەر دەمێک زمانی لاتینی مسولمانانی روژ هەلات بوە. مەیدانیشی لە ئەستەمبولەوە تا بنگال درێژەی هەبوە. لە رێگادا توشی هێندێ کەسی عێلی (زاب) بووین هەموویان بە شێوەیەکی شکۆ دار ئەسپ سوار بوو. سەر دەستەی سواران شالێکی کەسکی لە سەری هالاند بوو. ئەوانە لە مەککەی دەهاتنەوە. رۆژی دوایی پاش تێپەر بوون بە نێو سولەیمانیدا لە سەر رێگای گەرانەوە بۆ کەرکوک لە مەزرای دۆستی قەدیمی بەغدام - بابا عەلی کوری شێخ مەحمود - لاماندا لە شێوێکی جوان کە گەنم و توتنیان لێ چاند بوو، بە

چیای داپۆشراو بە دارستان و داری بەری گەمارۆ درا بوو نانمان خوارد.
دوای نانخواردن کوردەکان بە گشتی بە خزمەتکارانیشەوە نومایشی تفەنگ هاویشتنیان ساز کرد. لە دووردوە سکەی پچوکیان بۆ نیشانە دادەکرد.بوتلیان لە نەدیو دادەنا دیارە قسەی سیاسیش دەکران. بابا عەلی و دۆستەکانی دەیان گوت: تەنیا ئەوەیان لی دەوڵەت دەوێ کە لە گەڵ کوردان فەرق و جیاوازی دانەنێ. بابا عەلی دەیگوت : ئێمە بە بێ پشتیوانی هێزێکی گەورە هیچمان بۆ ناکرێ. یەهیعی بوو کە من و شوتر نیگەران بین کە وا پشتیوان دێ وەدیار بکەوێ. چونکە لە سەر رێگا تووشی کوردان دەبووین کاتێ لە بارەی رووسانەوە پرسیارمان لێ دەکردن دەیانگوت: هەر کەس یارمەتیمان بدا قەبوڵی دەکەین.
هەوڵ و تەقەلام بۆ نیزیک بوونەوە لە ناوچەی شەڕ لە سنوری سەرووی رۆژ هەلات ناکام ما. بەلام لە سەفەرێکی دیکەدا توانیم ئەم ناوچەیە کە ناوەندەکەی (رەواندز) بوو، بە تەواوی ببینم. ئەو سەفەرە لە هەولێرەوە دەست پێکرا. هەولێر شارێکی تورکمان نشینە لە نێو گوندی کورد نشیندا گەمارۆ دراوە. هەر ئەو جێگەیە کە ئەسکەندەر لە شەڕ لە گەڵ داریوشی پاشای ئێراندا شکا. سەعید قەزازی فەرمانداری کوردی ئەو شارە تەئسیری لە من کرد. ئەو رک و راست هەستی خۆی دەر بری. بۆ نمونی جارێکیان گوتی: (مەسەلەیەکی کوردی هەیە کە لە هەموو شت زیاتر لە دوو شت بێزارین. نە شیری وشتر نە دیداری عەرەب.)
لە کاتێکا لە هەولێرەوە بە نێو زنجیرە کێوەکاندا تێدەپەڕین، لە گرد و تەپکی رووت و رەقەنەوە گەیشتینە شیو ودۆڵی سەر سەوز و پڕ لە

گولاڵەی زەرد و سور و پاشان چیای ڕژد و هەڵەموت و داپۆشراو بە بەفر. مەزرا و باغات و لەوەڕگا لە بەرزاییەکان پڕ لە کورد بوون. ئەو کوردانەی کە پشتێندە ڕەنگ والاکانیان لیباسە کانی جوان کرد بوو. ئەوان پتر کۆچانی شوانیان بە دەستەوە بوو. بە گشتی تفەنگی لە سەر پێ یان دەشانیدا بوو. ئەو تفەنگانەی کە هێندێ جار بۆ راوی ئەو تۆ بەکار دەبران کە زۆر لە بزنە کێوی وشت و ڕەوەک گرنگتر بوو.

لە گەڵی ڕەواندز لە پەنا تاڤگەیەک فراوینمان خوارد. پاشان لە ڕێگای دەشتە دیانەوە گەیشتینە گوندی جوانی دیانە کە زۆربەی دانیشتوانی ئاسۆری بوون تا شەو لەوێ سەر بنێینەوە. ڕۆژی دوایی بۆ لای سنوری ئێران چوین لە دۆڵی بەر سیرین تێپەڕین ولە جادەیێکی بەرز کە سنوری دیاری دەکرد چاومان بە دوو کوردی سوار کەوت بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو دیو سنوریان دەپەڕاند و دەنگیشیان دەگەیشتە ئەو بەری دۆڵەکە.

پاشان بە ڕێگایەکی دیکەدا گەڕاینەوە تا سەری ماڵی پوشۆ بدەین کە لە بەغدا گەڕابۆوە. لە گەڵ برا و خزمانی کە قەد و بالایان وەک فوتبالیستان دەچوو، نانمان خوارد. یەک لەوان بە ناوی دینۆ پتر لە لای مەلا مستەفا دەبوو. ئەویتریان کە تۆزێ کزتر بوو ڕاست وە دۆستی دەورانی ( کەمپ ریچی) من، واتە ( ستوان دیک والترز) دەچوو. زۆر لە کوردەکان لە ئوروپاییان دەکەن. هێندێکیان بۆ سپیەتی و بۆری وەک ئەسکەندیناویان دەچن.

پەیمانی لەرزۆکی نێوان مەلا مستەفاو دەوڵەت هەر لە سەرەتاوە پچرابوو. لەم ناوەدا مەلا مستەفا هەوڵ دەدا کیژی سەرۆک عەشیرەتی

رکەبەری خۆی واتە ( زێباری) بخوازێ کە لە گەڵ بارزانیان نێوانی نەبوو. تا بەم کارە هەڵکەوتی خوی قایم بکا. دیارە بەم کارە نەختێ لە خۆ بایی بوو. لەوانەیە ڕووداوەکانی ئێرانی دراوسێشی بۆ ئەم هەنگاوە هاندەر بووبن. میر حاجی هاوکاری پێشتر تووشی ڕووداوەکانی ئێران ببوو. پەلاماری تازەی سۆڤێت بۆ ئێران کە هاو کات لە گەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی دووەم دەست پێکرا بوو، ئینگلیزەکانی دانیشتووی بەغدای نیگەران کرد بوو.

ئاخری فێوریەی ١٩٤٥ ( کورنوالیس)ی بالیوز جێگای خۆی دا بە ( هیواستین هیور برد). ئاو براو پێشتر لە عەرەبستانی سعودی خزمەتی کرد بوو. زیاتر لە ئەوەی پێش خۆی عیراقی لە ڕستەیەکی عەرەبی دا دەدیت. کەمێک دوای هاتنە سەر کاری ئەو ڕاوێژ کارانی قەدیمی لە بواری مەسەلەی کورد دا جێگای خۆیان دا بە کەسانی تر. یەکیان لێهاتو ترین مەئمورەکانی قەدیمی مازۆر ( سی.جی.ئیدمۆندز) بوو. مازۆر (ئار.اچ.دیچبورن) لە ئەفسەرانی قەدیمی دانیشتوی خوارووی عیراق هاتە جێی ئەو. ڕاوێژ کارانی سیاسی سەرووش جێگای خۆیان دابە ئەفسەرانی گەنجی بێ تەجروبە و بێ هەستی هاو دەردی لە گەڵ کوردەکان. بالیوز خانە هەر وەها کومیتەی ناوەندی ئیتیلاعاتی عیراقی خستە ژێر فشار کە ئەفسەرانی پێوەندداری ناوچە کە زۆریش لێهاتوو بوون بیانگۆڕێ.

مەلا مستەفا کە هەمیشە لە گەڵ ( ستێن هێور برد) لە پێوەندی دابوو، کاتێ وریا کەردوەیەکی لە لایەن بالیوزی تازەوە پێگەیشت( کە وەک عیراقیەکی باش و ئارام) ڕەفتار بکا، بێگومان سەری سوڕ ما.

مەلا مستەفا لە سنوری پانتایی عێلی خۆیدا حکومەتی سەر بەخۆی دانابوو. عیراقیەکان سەرەتای مانگی ئوتی ١٩٤٥ ویستیان پێگە شاخاویەکانی ئەو پەلامار بدەن. سەرۆکی هەیئەتی نیزامی بەریتانیا ژەنرال( دینتۆن) لە سەر ئەو باوەرە بوو کە ئەرتەشی عیراق بۆ ئەم پەلامارە ئامادەیی نیە. کاتێکی گوێیان نەدا بە قسەکانی کە دەیگوت ئەرتەشی عیراق توشی ئەو چارە نووسە دەبێ کە سالی ١٩٤٣ هاتە رێی، ئەو مەرکەزی فەرماندەیی خۆی لە هەولێر بە جێ هێشت و راوێژ کارەکانیشی لە لەشکری ئامادە بە شەڕی عیراق هێنا دەرێ.

لە گەل هەمووی ئەوانە ، عیراقیەکان بە ئاژین(ئیجرا) کردنی نەخشەی پەلاماری خۆیان، سەر بەخۆیی کردەوەیان لە ئینگلیز نیشاندا. رۆژی چواری سپتامبر ستونێکی ئەرتەش لە ئاکرەوە، ستونێکیش لە رەواندزەوە، ژاندارمەش لە ئامێدیەوە کەوتنە رێ.

لە جادەیەک کە دەگەیشتە بارزان یەکیان گرتەوە.

هەر وەک ژەنرال (رنتۆن) پێش بینی کرد بوو، هەر سێک ستون بە دەستی هێزی پچوکی کورد شکان. هێزێکی کە لە ١٥٠٠ کەس زیاتر نەبوو. عیراقیەکان نیزیکەی هەزار کەسیان لێ کوژرا. لە وەرزی زستاندا باسی شەڕ وەستان دەبیسرا.

هەر چۆنێک بێ ئینگلیزەکان و رەنگە مەلا مستەفاش هەر چەندە لاوازی ئەرتەشی عیراقیان بە بابەتی هەلسەنگاند بوو، بەلام لێهاتویی سیاسی عیراقیان بە کەم گرتبوو. ( مستەفا العمری) وەزیری نێو خۆی عیراق بۆ وتو وێژ لە گەل عەشیرەتەکان چوە سەرووی عیراق و بە دانی

بەرتیلی زیرەکانە و بە هەرەشە و هاندان توانی گرنگترین رێبەرانی کورد بە خەزوری مەلا مستەفا رێبەری تایفەی زێباریشەوە لە ریزی هاو کاردکانی مەلا مستەفا دابڕێ. لە ماوەی دوو حەوتوودا رێبەرانی عێلەکانی دیکەش رەگەڵ زێباریەکان کەوتن و وەک هێزی پەلامار دەری لەشکری عیراق مەلا مستەفایان لە مەتەرێزە شاخاویەکان وەدەر نا.

رۆژی حەوتی ئوکتۆبر لەشکری دەوڵەتی بارزانی گرتبوو. مەلا مستەفا لە گەڵ زۆر لە هاو خەباتیانی بەکار و لێهاتووی بە خاو وخێزانەوە لە سنور پەڕینەوەو گەیشتنە خاکی ئێران.( مەهەستی کوردستانی ئێرانە . و)

لە ئێران ژەنرالێکی سۆڤیێتی بە ناوی ( لیوبۆف ) بە مەلا مستەفای گوت: لە مەهاباد خۆی بە قازی محەممەد بناسێنێ و پیاوەکانیشی بخاتە بەر دەستی قازی. بەم کارە تێکۆشانی کوردەکانی عیراق بۆ ماوەیەک راوەستا و ناوەندی تێکۆشان بۆ ئێران گوێزرایەوە.

لە مانگی مارسی ١٩٤٦ کاتێ کە چوومە ئێران زانیم لە دەفتەری وابەستەگی نیزامی دا بووم بە کارناسی مەسەلەی کورد. دەوڵەتی ئێران رێگای چاپ و بلاو کردنەوەی رۆژنامەیەکی بە زمانی فارسی دابوو بە ناوی ( کوهستان ) دوکتور سمایلی ئەردەلان یەکێ لە بنەماڵەی ناسراوی ئەردەلانیەکان کە بنە چەکەیان لە ناوچەی کرماشان بوو بە رێوەی دەبرد. لە کوهستاندا نووسەرێکی نە ناسراو زنجیرە وتارێکی دەنووسی بە ناوی ( نهێنی یەکانی بارزان ) کە روونکردنەوەی حاڵ و رابردووی راپەرینی مەلا مستەفا بوو. لەم رۆژنامەیەدا هەر وەها زنجیرە وتارێکی دیکە چاپ دەکرا

له ژێر ناوی( بەسەر هاتی ئارارات ). نووسەری ئەم وتارە جگە لە ( ئیحسان نوری ) کە ئەو دەم لە تاران دەژیا، کەسیتر نە بوو. لە تاران لە گەڵ ئەو بوومە ئاشنا. ئەو تێکوشانی خۆی بۆ زیندوو کردنەوەی زمانی کوردی لە تورکیا بۆ روون کردمەوە. ئەو لە بتلیس هاتبوە دنیا ساڵی ١٩٢٤ وەک ئەفسەری لەشکری تورک فەرماندەی پۆلێکی ئەرتەش بوو.
بەڵام لە بەر ئەوە نەیتوانی سەر کوتکردنی توند و تیژی کوردەکان لە لایەن حکومەتی تورکیاوە قەبوڵ بکا،لە نیزیک سنوری عیراق کوردەکانی بۆ شۆرش و راپەڕین هاندا. راپەرین تێک شکا و شۆرشگێرەکان بۆ ئەو دیوی سنور هەڵاتن. پاش چەند ساڵ نوری لە پێشدا لە عیراق و دوایە لە ئێرانەوە دەستەی پچوکی گریلای لە نێو خاکی تورکیا دا رێبەری دەکرد. ساڵی ١٩٢٨ رەگەڵ هێزی راپەرین کەوت کە لە ناوچەی ئارارات دژی تورک راپەڕیبوون.
رووسەکان سەبارەت بە راپەڕینی کوردان بۆچوونێکی باشیان نەبوو. یەک لەو هۆیانەی کە رووسەکان موافیقی نە بوون، پێوەندی کوردە ناسیونالیستەکان بوو لە گەڵ رێکخراوی (داشناک)ی ئەرمەنستانی شورەوی. هەر بەو دەلیلەش هێندێ لە هێزەکانی سنور داری شورەوی بۆ پشتیوانی لە تورک نێردرانە ئارارات. کاتێ ساڵی ١٩٣٠ رەزا شا لە پەیمانێک دا رێگای دا بە سەر بازانی تورک کە بۆ راو نانی شۆرشگێرانی کورد لە سنوریش بپەڕنەوە، راپەرین سەر کوت کرا. ئیحسان نوری رایکرد بۆ ئێران. هەر چەند هێندێ لە راپەریوەکان تا ساڵی ١٩٣١ بەر بەرەکانیان درێژە پێدەدا.

له تاران له گەڵ دوو کوردی دیکه پێوەندیم گرت. ئەوان له دوو قوڵی دژ به یەکتر بوون. یەک له وان به ناوی عەبدولاغای دێبۆکری نوێنەری پارلمانی ئێران و یەک له رێبەرانی تایفەی دێبۆکری بوو که له خوارووی گۆلی ورمێ دەژین. زۆربەی ئەفرادی ئەم تایفەیە لایەنگری بزوتنەوەی مەهاباد بوون. عەبدولاغا سەبارەت بەم هەستە زۆر گرژ و نارەحەت بوو. لای وابوو که ئەم رێگایه دەگاته شۆرشی سۆسیالیستی ژێر دەسەلاتی شورەوی. کەسێکی دیکه که پێوەندیم له گەڵی هەبوو، گەنجێک بوو به ناوی ( هاشمی شیرازی )خەڵکی مەهاباد که بۆ فێر بوونی زمانی کوردی یارمەتی دەکردم. کاتێ لێم پرسی چۆنه فامیلی شیرازی یه واته له خەڵکی شیرازه که له گەڵ (موی بۆر و چاوی کاڵی وێنەدەچوو) گوتی : باوکی سەبارەت به ئەڤینی توندی به شیعری حافز و سەعدی، به شیرازی ناسراوە.

شیرازی لایەنگری توندی قازی محه مەد بوو. له گەڵ مەهاباد له پێوەندی دا بوو. ئەو رێگای چونی منی بۆ ئەوێ خۆش کرد. ئەو هەر وەها بروای به شۆرشی سۆسیالیستی هەبوو. چو بوە نێو حیزبی تودەوە. ئەو بیرو باوەرە بوو به هۆی ئەوە که ئاخرەکەی سەر له زیندان وەدەر بنێ. هەر چەندە له زینداندا وازی له بیر و باوەری سۆسیالیستی هێنا. بەلام دڵنیام قەت وازی له ناسیونالیزمی کوردی نه هێناوە،

رۆژی ۱۲ی ئەوریلی ۱۹٤٦ کەمتر له مانگێک بوو گەیشتبوومە تاران له گەڵ ستادی ئەرتەشی ئێران وام رێکخست که بچم له سنه له ناوچەی خوارووی کوردستان چاوم به فەرماندەکانی ئەرتەشی ئێران بکەوێ.

فەرماندەی ئەویّ هەمان ژەنراڵ ( ئامانولا جیهانبانی ) ناسراو بوو. مەئموری ئەوە بوو کە لە نێو تایفە گەلی سەر بزێوی سنوری عیراق دەسەلاتی حکومەتی ئێران مسۆگەر بکاتەوە. ئەم تایفە گەلە لە ژێر دەسەلاتی حەمە رەشید ناوێکدا بوون کە بە سەر کردەی ڕێگران حیساب دەکرا.

سالی ١٩٢١کاتێ لەشکری رووس و ئینگلیز ئەرتەشی ئێرانیان لە ویّ وەدەرنا بوو، ئەو لە سنور پەڕیبۆوە و هاتبوە خاکی ئێران و لە شاری بانە دانیشتبوو. شاری دراوسێی بانە، واتە سەردەشتیشی خستبوە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. تا سالی ١٩٤٤ فەرمانداری غەیرە رەسمی ناوچە بوو. تا لە ئاخردا لەشکری ئێران گەرایەوە و هەر تک شاری ئەستاندنەوە. بەلام تا هاتنی جیهانبانی نیوە راستی مارسی ١٩٤٦ ژانە سەری بۆ دەولەتی ئێران پێک دەهێنا. کاتێ چاو پێکەوتنی من سەربازانی ئێرانی هێشتا لە گەل کوردانی سەر بزێو لە کێشە دابوون.

شۆفیری من (قەرەپێتی ئەرمەنی) لە رادە بەدەر زەلامێکی بە کەلک بوو.ئەو تورکی ئازەری کە هەر تورکی پێدەگوترێ و زمانی هاو بەشی خەلکی ناوچەی سەرووی رۆژ ئاوای ئێرانە، بە باشی دەزانی. زمانی رووسیشی دەزانی. جگە لەوە سەری لە سیاسەتیش دەر دەچوو. لە وتو وێژەکانیدا لە گەل خەلکی ناوچە ئاگاداری پتری وەر دەگرت لە وەی کە من لە وتو وێژی رەسمیدا وەگیرم دەکەوت. ئەو دەم رۆژێکی تەواوی دەخایاند تا لە تارانەوە بگەنە کرماشان. کاتێ لە کرماشان تێپەڕین هەوا تاریک ببوو. باو کێژەلوکەیەکی توندیش هەلیکرد بوو. لە پڕ ترومبیلێکی

نیزامی رایگرتین. سەرهەنگ دوودم و سەر جۆگەیەکی ئەمریکایی تێدا بوون. ئەوان بۆ شێو خواردن داوەتیان کردم. کاتێ گەیشتمە ماڵی سەرهەنگ بە سەر سوڕ مانەوە سەرهەنگم دی لە سەر پلیکانان بە بیجامەوە هاتۆتە پێشوازم و دەڵێ: کاپیتان راست وەرە سەرێ. لێرە باسی تەشریفات و تەعارف نیە. من دڵم بەوە خۆش کرد بوو کە لە وانەیە بتوانم ئاگاداری لە سەرهەنگ وەر بگرم، بەڵام هەوەندە سەر خۆش بوو بە زمانێ گیراو و لاڵە پەتە و جێگای گومانەوە لە منی پرسی:( بۆ چی دەتەوێ ئەوانە بزانی ؟ )

بەیانی زوو دوای قاوڵتی خواردن ماڵاوایيم کرد و بە رێگایێکی خاکی دا بەرەو کوردستان - ئەم ناوە بە سنە دەگوترێ-. دیمەنێکی جوان بوو. بە تایبەت پاش باران رەنگی هاتبۆوە بەر، گاشە بەردی رووتی چیاکان دەشتی سەوزیان گەمارۆ دابوو. لە دوو شوێنی جادەش گەرۆک ئێمەیان راگرت و گۆرانیان بۆ گوتین. خەڵکی ئەم ناوچەیە لە باری رەگەزی یەوە کورد بوون. بەڵام بە پێچەوانەی کوردەکانی ناوچەی سەروو شیعە بوون و دیار بوو پتر لەوە لە گەڵ کەش و هەوای ئەوێ رێک کەوتبوون کە بتوانن لایەنگری لە ناسیونالیزمی کورد نیشان بدەن.

دوای نیوە رێ گەیشتینە سنە. چومە کێشکی فەرمانداری و کارتی خۆم بۆ ژەنراڵ جیهانبانی نارد. کورج بانگی کردم و بە خواردن و شەراب میوانداری کرد. بۆ بیستنی کورتەیەک لە عەمەلیاتی دژی عەشیرەتە راپەریوەکانی ناوچە شاخاویەکان منی بردە بارەگای فەرماندەریی خۆی. وا دەهاتە بەر چاو کە تا رادەیەک سەر کەوتوە و کۆنترۆڵی گوندە

سەرەکیەکانی بانەو سەدەشتی لە بەر دەست دایە. هەر چەندە هێشتا کوردەکان لە چیاکانی دەور و بەر دەسورانەوە.

جیهانبانی کە لە ٦٠ ساڵ نیزیک دەبۆوە، کورتە باڵایەک بوو بە بیچمێکەوە کە دەکرا بە روخساری شارستانیەت دابنرێ. چاویلکەی لە چاو دەکرد ومووی سپی و پری هەبوون. لە تاران سەر بردەی ژیانیم خوێند بۆوە. دەمزانی لە تایفەی قاجارە، ئەو تایفەی کە پێش ئەم بنە ماڵەیە پاشایەتی ئێرانیان لە دەست داوە. ئەو بە گەنجی بە گوێرەی دابی خۆیان ئامۆزای خۆی خواستبوو.

باوکی لە شەڕی یێکەمی دنیا گردا کاتی پەلاماری رووسان بۆ تەورێز ئیعدام کرا بوو. پاشان رووس بۆ دڵدانەوە کورەکەیان برد بوە مۆسکۆ لە مەدرەسەی تۆپخانەی ئەرتەشی پاشایەتی پێیان خوێند بوو. پاشان لە زانکۆی ستادی گشتی رووسیا وەریان گرتبوو. بەم پێیە رووسەکان چ پێش و چ لە دوای شۆرش بە هی خۆیان دەزانی. هەر چەند بە بڕوای رووسان سەبارەت بە (رەگەزی نزم) ئەوە یەکی نە دەگرتەوە. جیهانبانی لە گەرانەوەدا بۆ ئێران لە گەڵ کیژێکی خەڵکی رووسیا دەبێتە ئاشنا کە باوکی یەکێ لە مودیرانی ناوچەیی تێلگراف بوو. ساڵێک دوای ئەم ئاسیاریە دەیهێنێ. خانمی ئەو کە ناوی ( ئێلینا خانم) بوو لە کۆڕ و کۆمەڵی تاراندا ناسراو وسەر بە دەرەوە بوو. لە دۆستانی خانم ( لوئیز دریفوس) ی خێزانی بالیوزی ئەمریکا بوو. بەڵام کاتێ من لە وێ بووم ئەو لە یێکیێتی سۆڤیێتی بوو.

جیهانبانی لە کۆتایی شەری یەکەمی دنیا گردا بۆ ئێران گەرایەوە. بە

دەرەجەی سەر گوردی چوە پۆلی تۆپخابەی بریگادی قازاخ کە لە ژێر فەرماندەیی رەزاخان دابوو. بەلاّم رەزاخان قەت بڕوای پێ نەکرد. کاتێکی کودیتای کرد و جلەوی حکومەتی گرتە دەست دوو ریژان جیهانبانی دوور لە پێتەخت راگرت تا دلنیا بێ نەخشێکی گرنگ لە کودیتادا یاری ناکا. پاشان جیهانبانی چوە مەدرەسەی نیزام لە پاریس و دوایە بۆ وەر گرتنی کارو باری سەرووی ئەرتەش هاتەوە نێران گەیشتە پلەی پشکنێری گشتی سەرۆکی ستادی وەزارەتی بەر گری. بەلاّم رەزا شا قەت خۆشی نەدەویست. رەنگە لە بەر ئەوەش بوو بێ کە مابەینی کۆمەلاّیەتی نێوان جیهانبانی نەجیب زادە و فەرماندەیەکی دێهاتی کە ببوە شا زۆر قوول بوو.

جیهانبانی فەرانسەیی بێ لەهجە دە پەیڤی. چونکە خۆم لە گەڵی دوا بووم، دەمزانی. رەفتاری رەزا شا لە گەڵ جیهانبانی رەفتاری ئاغاو نۆکەران بوو. بە سوکی چاو لیدە کرد، ناوی خەراپی لێ نابوو. کاتی تورە بوون تێی هەڵدەدا.

ئاخرەکەی سالی ١٩٣٩ دڕدۆنگی شا کاری خۆی کرد و جیهانبانی بە جارێ لە ئەرتەش دەر کرا. کاتێ کە من چاوم پێکەوت هێنابوویانەوە ئەرتەش و مانگێک بوو نارد بوویانە سنە تا لە مەرکەز دوور بێ و لە مەترسی پیلانگێرانی لە ئەماندا بن. لای رۆژ ئاوا روونکردنەوەکەی تەواو بوو. پاشان منی دا بە دەست ئەفسەرێکی ستادی خۆی بە پێیان بردمی بۆ شەقامەکانی شار و بۆ گۆرە پانێ گشتی کە پڕ بوون لە کورد بە لیباسی ناوچەیی. گوتی ئەوە مەیدانی ( چبکەم)ە. بۆیە ئەم ناودیان لێ

ناوە کە خەڵک بێکارن دەڕۆن تا ئاخری شەقام و لە وێ دەوێستن، نازانن چبکەن بە لای ڕاست دا بڕۆن یا بە لای چەپدا.

ڕۆژی دوایی بەیانی چوومەوە کن جیهانبانی و هاو کارەکانی. تا بە سواری ئەسپ سەرێکی پادگانی ڕۆژئاوای شار بدەین. ئەسپی من ئەسپێکی عەرەبی بوو. سەر کێش و ئانارام. مەجبور بووم توند لغاوی بگرم وبە درێژایی ماوەی بەیانی هەڵدەبەزی. ترسم هەبوو بمخات و ڕیسوا بم بە تایبەت لە پێش ئەو سەر بازانەی هاتبوونە پێشوازمان.

لەوێ سەربازان نومایشێکی شەڕیان بەرێوە برد. ئاوا بوو کە سوارە نیزام بو نیشاندانی عەمەلیات و پەیجوری چوونە تەپکەکانی سەرووی مەیدان و بە دوای ئەواندا ئێمە و سەربازیش هەرەکەمان کرد تا ئەو پەلامارەی لە سەقزەوە دێ تێکی بشکێنین. چیاکان بە شەبەقی ئەو ئاوێنانەی کە بە شێوەی قەدیم بۆ نیشاندان بە کار دەهاتن، ڕووناک ببوون.

جیهانبانی لە گەڵ ژێر دەستەکانی تەماشای مانۆری دەکرد. پاشان بەر لە گەڕانەوەمان بۆ سنە لە دەور و بەر سورراینەوە و شوێنی هێزەکانمان تەماشا کرد. ئەسپەکەم تا کۆتایی دەستی لە سەر کێشی هەڵنەگرت.
هەستم کرد جیهانبانی پێی ناخۆش نەبوو لە هەردم بدا و لە پێش چاوی سەر بازان بە ڕیسواییم ببینێ.

گومان لەوە دا نەبوو کە جیهانبانی دۆستی ڕووس و ڕووسیایە هەر چەندە لە گەڵ سیستمی حکومەتی سۆڤیێتی موافیق نەبوو. لەوانە بوو ئەمریکاشی خۆش گەرەگ نەبێ. بەڵام لە گەڵ من ڕەفتاری فرە دۆستانە بوو.بۆ چی ؟ نازانم. لەوانەیە زانینی زمانی فەرانسەیی و ڕابردووی نێو

ئەتەودییم لە شێوە رەفتاری ئەودا تەئسیری بووبێ. دوای گەرانەودم بێ سنە ژەنرالێ چیرۆکی زۆری بۆ گێرامەوە لە چۆنیەتی شکاندنی سمکۆ لە نیوەی دەیەی ۱۹۲۰دا بە ۱۱هەزار سەر بازەوە بەرانبەر نیزیکەی ۱۰ هەزار کورد و تورک. ئەو دەیگوت سمکۆ نەیدەتوانی باوەر بکا کە لەشکری ئێرانە بەرەنگاری بوە. چونکە لە رابردودا سەربازانی ئێمە چالاکی باشیان نەبوو. بەڵام هەموو شت گۆرا بوو. لەشکری ئێمە لەشکریکی بە فیز و غەرە بوو.ئەو پەری هەول و تەقەلای دەدا کە ئەم چۆنیەتیە لە لەشکری ئێراندا زیندو کاتەوە. ئەوەش لە ناوچەیەک کە بە شێوەیەکی خەفەتاوی جێگای خالی دیار بوو.

### کۆماری کوردی مەهاباد

داستانی کۆماری کوردستانی ژێر چاوە دێری سۆڤێت لە مەهاباد فەسلێکی جێکای سەرنجە لە مێژوودا و من لە راستیدا تاقە چاودێری ئەمریکایی بووم لە مەیداندا. سۆڤیتیەکان دوای چاو پێکەوتنی رێبەرانی کورد سالی ۱۹٤۱ لە باکۆ ئەوەندە سەرنجی کوردەکانیای نەدەدا. چونکی گرفتاری مەسەلەی شەرِ بوون. بەلام ئەو گرفتاریەش بە هیچ جۆر نە ببوە

هۆی ئەوە کە لەو سەر زەمینەی نێوان ناوچە داگیر کراوەکانی ئینگلیز و سۆڤێت دەست لە سەر دەست دابنێن و هیچ نەکەن. ئۆردوی سوور کە ئەو زەمان زەحمەت بوو بە ئۆردوی مۆتۆریزە دابنرێ هێشتا تا رادەیەکی زۆر بار و هاتو چۆی بە ئەسپ بوو. دەلالانی سۆڤێت زۆر جار بۆ ئەسپ کرین دەچوونە نێو کوردان.

یەکێ لەو ئەسپ کرانە بە ناوی عەبدولا یۆف جگە لە ئەسپ کرین وەک مەئموری نهێنی سۆڤێتی ئەرکی دیکەشی لە سەر شان بوو. ئەو لە دوکانی ئەرمەنیەکی ئارەق فرۆش لە گەڵ کوردێکی کە لە پەنای دانیشتبوو دەرگای ئاشنایەتی کرد بۆوە. ئەوەش بە هەلکەوت ئەبوو کە ئەو کوردە یەکێ لە دامەزرێنەرانی رێکخراوی ناسیونالیستی کۆمەڵە بوو. ئەوکوردەش مەئموری سۆڤێتی بە رێبەرانی دیکەی کۆمەڵە ناساند بوو. لەو دەمەوە کۆمەڵە بە ناچاری کەوتە نێو جەغزی سۆڤێتەوە. بە تایبەت دوای ئەوەی کە قازی محەممەد سالی ١٩٤٤ رێبەرایەتی کۆمەڵەی گرتە دەست.

بێجگە لە دەلالانی ئەسپ کرین مەئمورێکی دیکەی کوردی خەلکی سۆڤێت بە ناوی کاپیتان ( جەعفەر یۆف) یش هەبوو کە لیباسی کوردی دەبەر دەکرد و لە گەڵ تەواوی سەرۆک عەشیرەتانی کوردی ناوچەی سەروو پێوەندی بەر قەرار کرد بوو. ئەو تاقە مەئموری کوردی سۆڤێتی بوو لە ناوچەدا. مەئمورەکانی دیکە هەموویان ئازەر بایجانی بوون وەک : هاشمۆف کونسولی سۆڤێت لە ورمێ و کاپیتان ( نوماز عەلی یۆف) ئەفسەری سیاسی سۆڤێتی لە میاندواو. هەمووی ئەوانە لە گەڵ مەئموری بەرزی سۆڤێت لە تەورێز بە ناوی ژەنراڵ ( سەلیم ئەتا کشی یۆف)

پێوەندیان هەبوو. راپۆرتی کاری خۆیان بۆ ئەو دەناردەوە.

ئەتاکشی یۆف کە دەیویست بۆ راپەراندنی گەلاڵە و نەخشەکانی سۆڤیێت لە ژێر رێبەرایەتی یەک لە کوردان رێکخراوێک دابمەزرێنێ، هێندێ لە سەرۆک عەشیرەتی بۆ پیادە کردنی نەخشی رێبەرایەتی لە بەر چاو گرتبوو کەسێکی شیاو و لێهاتووی نەدیتبۆوە. لە سەرەتای ساڵی ۱۹٤٥بۆی دەر کەوت کە قازی محە مەد رێبەری کۆمەڵە لێهاتوویی راپەراندنی ئەم نەخشەیەی هەیە. لە ئاوریلی ساڵی ۱۹٤٥ رێکخراوی تەبلیغاتی سۆڤێیت( خانوی ڤۆکس) لە رێو رەسمێکدا ئەنجومەنی کولتوری سۆڤێیت - کوردستانی لە مەهاباد دامەزراند. یەکێ لە بەرنامە سەرەکیەکانی ئەم ئەنجومەنە پێکهێنانی نومایشنامەیەکی ناسیونالیستی کوردی بوو. مەسەلەی سەرەکی ئەم نومایشە بریتی بوو لە پەلاماری سێ کەسە چەپەڵ و شەرلاتان - واتە ئێران و عیراق و تورکیا - بۆ سەر زەمینی کوردستان و ئاخرەکەشی رزگاری دایکی نیشتمان بە دەستی کورەکانی. تەماشاچیەکان کە تا ئەو دەم ئەوەندە شارەزای نومایش و تیاترۆ نە بوون، بە قووڵی کەوتبوونە ژێر تەئسیر و دوژمنانی کۆنیشی بە ئەسرین رشتن سەریان دەخستە سەر شانی یەکتر و سوێندیان دەخوارد کە تۆڵەی کوردستان دەستێننەوە.

بە دوای ئەوەدا زۆر جار مەئموری رووس لە مەهاباد دەر دەکەوتن. رۆژێک لە مانگی سپتامبر دا کاپیتان ئوماز عەلی یۆف هاتە مەهاباد و قازی محە مەد و رێبەرانی دیکەی کوردی بۆ تەورێز داوەت کرد. لە تەورێز رێبەرانی دیکەی کوردیش رەگەڵ کەوتن و هەموویان بەرەو باکۆ بە

قەتار کەوتنە رێ. لە باکۆ پێیان گرتن پێشنیارەکانیان سەبارەت بە دوا رۆژی ناوچە بنووسن تا بدرێ بە (جەغفەر باغر یۆف) سەرەک وەزیری ئازەربایجانی سۆڤێتی. ئەوانیش هەر وەک چاوە روان دەکرا پێشنیاری دامەزرانی دەوڵەتی سەر بەخۆی کوردیان بە یارمەتی سۆڤێت نیشاندا. لە دانیشتن و چاو پێکەوتندا لە گەڵ باغر یۆف، ناو براو بە رێبەرانی کوردی گوت: هەر چەندە سۆڤێت لایەنگری سەر بەخۆیی هەموو نەتەوەکانی جۆر بە جۆرە، بەڵام ئێستا ئەوان دەبێ لە پێناو پێکهێنانی دەولەتێکی خود موختاری (دێموکراتیک) کە هەموو ئازەربایجان بگرێتەوە هاو کاری بکەن. باغر یۆف حیزبی تودە وکۆمەڵەی کوردستانیشی بە کەم داناو پشتیوانی سۆڤێتی لە حیزبی تازە دامەزراوی دێموکراتی ئازەربائجان راگەیاند. جەختیشی لە کوردەکان کرد ئەکەر بە شێوەی تاکتیکیش بێ رەگەڵ ئەم حیزبە کەون و لە راپەرینی گشتیدا بەشداری بکەن.

قازی محەمەد لە وەڵامی جەختی باغر یۆف دا لە سەر داوای خود موختاری کوردەکان پێی داگرت. باغر نۆف بەڵێنی دا کە سۆڤێت لە خود نوختاری کورددکان پشتیوانی دەکا. هەر وەها وەڵامی ئەرێنی داوە بە داخوازی قازی لە مەڕ یارمەتی نیزامی. لە سەر دامەزرانی حیزبێکی دێموکراتی کوردستان رێک کەوتن.

قازی لە گەرانەوەدا بۆ مەهاباد لە گەڵ مەسەلەی هاتنی مەلا مستەفا بەرەو روو بوو کە سنوری پەراند بوو هاتبوە خاکی ئێرانێ. لە هەوەڵین چاو پێکەوتنی قازی و مەلا مستەفادالە مەهاباد لە سەر جێگیر بوونی بارزانی و شۆرشگێرانی وهاو کاریی ئەو تایفەیە لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی قازی

محه ممەد گەیشتنە یەک.

له مانگی نوامبری ١٩٤٥ قازی داوای له سەرۆک عەشیرەت و ڕێبەرانی شار کرد له ناوەندی ئەنجومەنی تازەی کولتوری سۆڤێت - کوردستان کۆ وەبن. لەو کۆبوونەوەیەدا قازی دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ڕاگەیاند. پاشان حیزبی تازە بە بڵاو کردنەوەی بەیاننامەیەک له نێو وڵاتی ئێراندا داوای خود موختاری مەحەللی کرد. ئەو ئامانجەی قازی قەت لێی لانەدا و بوو بە هۆی یەکێتی و برایەتی له گەڵ میللەتی ئازەربایجان.

هەر لەو مانگە دا حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان دەستی کرد بە پەرە پێدانی نفوزی خۆی و دەست بەسەر داگرتنی بنیاتەکانی دەوڵەتی ئوستان و ڕۆژی دوازدەی سپتامبر هەوەڵین کۆبوونەوەی مەجلیسی میللی ئازەربایجان کرایەوە. قازی محه ممەدیش نوێنەری بۆ ئەو مەجلیسە نارد. بەڵام ئەو نوینەرانە پاش ئەوەی له یەکەمین دانیشتنی مەجلیس دا بۆیان دەر کەوت کە ئازەربایجانی خەیاڵیان نیە سەر بەخۆیی کوردستان بە ڕەسمی بناسن، بە دەستوری قازی بۆ مەهاباد گەرانەوە. قازی ڕۆژی ٢٢ی ژانویەی ١٩٤٦ لە کۆبوونەوەیەکی مەزنی گوند و شاریدا، دامەزرانی کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند و خۆشی بە سەر کۆمار هەڵبژێردرا. قازی لەو ئاهەنگە دا بە حوکمی شوێنی تازەی و مەسڵەحەتی سیاسی لیباسێکی وەک ئونیفۆرمی ئەرتەشی سۆڤێتی لەبەر دابوو کە هیچ لە گەڵ مێژەری سپی کوردی نەدەهاتەوە.

قازی زۆری حەز دەکرد کە ئەرتەشێکی میللی پێک بێنێ تا له پاڵدان

به سەرۆک عەشیرەتان کە وەفاداریان جێگای شک و گومان بوو کەم بکرێتەوە. ئەفسەرێکی سۆڤیێتی کە لە مەهاباد بوو کرا بە مەئمور کە لە رێکخستنی ئەرتەشدا یارمەتی قازی بدا.

ئەم ئەفسەرە کاپیتان (سەلاحە ددین کازمۆف) بوو کە بە کاکاغا بانگ دەکرا. کاکاغا بە ئامادە کردنی هێندێ ئونیفۆرمی رووسی دەستی کرد بە دامەزراندنی ئەرتەپیک کە چوار سەهەنگی هەبوون. خودی کاکاغاو سێ کەسیش لە هەڵکەوتوو ترین سەرۆک عەشیرەت واتە ( مەلا لستەفا و حەمە رەشید و ئەمەر خانی سەرۆکی عێلی شکاکان. دیارە ئەم ئەرتەشە لێهاتوییێکی تەواوی نەبوو. هەر چەندە ٦٠ لاوی کورد بۆ فێر بوونی نیزامی ناردرانە باکۆ.

وردە وردە ئەو عێل و عنشیرەتانەی کە لە گەڵ ئەرتەشی ئێران لە شەڕ دابوون و هەوڵیان دەدا لە سەقزەوە بۆ لای خواروو پێشرەوی بکەن، ئەژماریان کەم دەبۆوە تا وای لێهات کە تەنیا بارزانیەکان واتە نیزیکەی ۱۲۰۰ پیاوی ئەمەگداری مەلا مستەفا مانەوە. ئاخرەکەی پاش چەند جار شەڕ لە گەڵ لەشکری دەوڵەتی ناوەندی سەرۆکی پشکێنێ گشتی ئەرتەشی ئێران ژەنراڵ رەزمارا رۆژی ۳ی مانگی مای قەراردادێکی شەڕ وەستانی لە گەڵ هێزەکانی کورد ئیمزا کرد کە بە گوێرەی ئەو خەتی شەڕ وەستان لە دەوروەی شاری پچوکی بۆکان لە سەرووی سەقز و لە سەر رێگای مەهاباد دیاری کرا بوو. هەر چەند ئەم قەرار دادە لە لایەن دەوڵەتی قازی محە ممەدەوە قەت بە رەسمی نە ناسرا، بەڵام چوونە دەری ئەرتەشی سۆڤیێتی لە ئێران رۆژی ۲۰ی مانگی مای بێگومان یەک لەو

هێیانە بوو کە کوردەکان سیاسەتی پەلامار دەرانەی خۆیان وەلا نا و بە کردەوە بڕیاری شەڕ وەستانیان لە بەر چاو گرت.

ئێستا ئیتر ڕێگا کرا بۆوە وەمن دەمتوانی سەری سەقز بدەم و چاو پێکەوتنێک کە ماوەیەک بوو نەخشەم کێشا بوو ئانجامی بدەم. ڕۆژی ١٢ی یولی بە ترومبیلێکی جیپ لە کرماشانەوە کەوتمە ڕێ و بە نێو مەزرای گەنم و توتن دا لە کەلی مەحمودئاوا گەیشتینە ناوچەی نیزامی و سەرهەنگێکی ئەرتەشی ئێران ڕەگەڵمان کەوت. ئەو بورجی ڕوانینی سەر بەرزاییەکانی پێ میشان دەداین کە لەبەر دەستی یاخیەکان دابوو. ئەم تایفانە لە ماوەی مانگی ڕابردوودا دوو جار ئەو جادەیان پەلامار دابوو.

لە سەر ڕێگامان بەرەو سەقز چاومان بە سەر لەشکر هومایونی کەوت کە مانگی پێشوو لە خوزستانەوە هێنا بوویانە ئەم ناوچەیە. ئەو لە خوزستان لێهاتوویی خۆی نیشان دابوو.

هومایونی زەلامێکی لوت بەرز بوو بە بالایەکی بەرز و لوتێکی هەڵۆیی و موی سەری بۆ پشتەوە شکابوونەوە. ئەو بە توانایی ئاخافتن و ڕاستی و بزەی سەر لێو کاری لە من کرد. ئاخر لەو کاتەدا ئەو خاسیەتانە لە نێو ئەفسەرانی ئێرانیدا زۆر نەبوون. بە تەواوی دیار بوو کە ئەفسەرێکی بە کار و لێهاتوە. وا قاو بوو کەلە شەو وڕۆژدا ١٨ سەعات کار دەکا. منی بردە دەفتەری کاری خۆی و ئاگاداری تەواوی دامێ. هێزێکی گرنگ کە لە بەرانبەری ئەو وێستا بوو، نیزیکەی ٩٠٠ شەڕکەری بارزانی بوون کە لە لای سەرووی سەقز جێگیر ببوون. حەمە ڕەشید بە ٢٠٠ کەس دۆڵێکی سەر جادەی بانەی گرتبوو. جگە لەوە زیرۆ بەگی بەهادوری و عەشیرەتی

دیکەش لە گەڵ بارزانیەکان بوون.

ئێمە لە گەڵ سەرهەنگ دووەم ( عەلی غەفاری) ئەفسەری بەر پرسی پێوەندی لە گەڵ عێلات سواری فرۆکەیەکی پچوکی شارەزایی (تایگرمات) بووین. من تا ئەو دەم جگە لە نێو فیلمەکانی شەری یەکەمی دنیا گردا نەبێ، فرۆکەی ئاوام نەدیبوو. لە بەرانبەر بادا پەردەی نە بوو. فرۆکەوان لە سەندەڵی پێشەوە و منیش بە کەلک وەر گرتن لە چاویلکە و گوشی لە پشت سەری ئەو دانیشتم و ئەوە یەکێ لە ئەزموونی هەرە بە ترسی ژیانم بوو. فرۆکە وان پیاوێکی گەنجی روو خۆش بوو کە دایم گوێم لە دەنگی دەبوو دەیگوت:( وێری گود، جانی ). من بە هەشت قایش لە سەندەڵی قایم کرا بووم، بەڵام دیسان کاتێ فرۆکە وەحەوا کەوت هەستم بە ئەمنیەت نە دەکرد. داشبورد و بەشی تایبەتی کلیلەکانی فرۆکە گەلێک سەرەتایی دەهاتنە بەر چاو. باڵە زیادەکانی فرۆکە بە سیمی تایبەتی پێکەوە لکێنرا بوون. ئێمە بەم فرۆکەیە بە سەر قەڵایەکدا تێپەرین لە سەر چیا بە دەست ئەرتەشی ئێرانەوە بوو. لە دەورو بەریشی شوێنە واری خێوەتی کوردان دەهاتە بەر چاو. فرۆکە بە سەر بەرزایی چیای نێوان بانە و سەقز و پاشان ئەویتر بەسەر شارەکانی بانە و سەدەشت دا دەفری کە ناوچەی نیزامی بوون لە گەمارۆی کوردەکاندا. من لە گەڵ ئەو هەموو ترسەش وەک هەڵۆیەک بە خۆم دەنازی. بایەکی توند وە چروچاوم دەکەوت. بە سەر چیاکانی پر لە دارستان و دۆڵی سەر سەوزی چیاکانی عیراق کە لە لای رۆژ ئاواوە بە بەفر داپۆشرا بوون دەفرین. لە پر لە بانە هاتینە خوار و بۆ بورجێکی خشتی و قوری پێشمان کەوتن. لە گەرانەوەدا فرۆکەوانەکان بە نومایشی

بەرز بوونەوە هاتنە خوار بۆ نشیو خۆیان دەخافلاند. فرۆکەی من لە هاتنە خواردا هەر چەند سورێکی توندی خوارد، بەلام بە سلامەتی لە باندی فرۆکە خانەی سەقز هاتە خوار. لام وابوو ئەفسەرانی دیکەی ئێرانیش لەم هاتنە خوارە هەر وەک من هەستیان بە ئەمنیەت و ئاسایش دەکرد. ڕۆژی دوایی فرۆکەوانی من سواری کردم و هەوەڵین قۆناخی گەڕانەوەم بۆ لای شاری هەمەدان دەست پێکرا. لە سەر شاری هەمەدان دوو بارە فرۆکەوان لە بەرزاییەکی کەم بە سەر شاردا سوڕاوبە هاتنە خواری سەرەو ژێر لە نیزیک دۆستانی کە چاوە ڕوانی بوون لە عەرزی نیشت. دوای حەوتایێک کاتی بەستم یەک لە فرۆکەوانەکان لە نێوان سەقز و بانەدا کەوتوە و بە دوای ئەو دا فرینی ئەو فرۆکانە قەدەغە کرلوە پێم سەر نەبوو.

لەو ماوەیەدا هەر چەندە جەبهەی سەقز ئارام و بێدەنگ بوو. بەلام نا ئارامی لە سەروو لە سناری غەیرە رەسمی نێوان کوردستان و ئازەربایجان سەری هەلدا بوو. کورد و ئازەربایجانی لە خۆیە و لە ورمێ و لە میاندواو بە فڕ یەکدا چوو بوون. بەلام کار بەدەستانی سۆڤێت بە هەڕەشە کۆتاییان بە تێک هەلچونەکە هێنا بوو.

ڕووسەکان ئێستا لە ئێران دەر چوو بوون. وایان بە مەسلەحەت دەزانی کە مەئموورە سیاسیەکانیان وەک ناو بژیکەر بۆ ڕێک کەوتنێک لە گەڵ قەوامی سەرۆک وەزیر دەست بە کار بن. ئاخرەکەی دێموکراتەکان گەیشتنە ڕێک کەوتنێک و ئازەربایجان بە ناوچە کورد نشینەکانەوە جارێکی تر بە ناو بۆوە بەشێک لە ئێران و ڕێبەرانی حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان هەر لەو شوێنانە دانرانەوە کە بۆ خۆیان دایان نابوو. دیارە ئەم

تەرتیباتە بە کەیفی کوردەکان نەبوو. چونکە دیموکراتە ئازەربایجانیەکان شوێنی خۆیان کرد بوە قانونی، بەڵام قازی محەممەد و دەوڵەتی خود موختاری ئەو سەریان بێ کڵاو ما بۆوە. ئەو کوردانەی پێشتر لە دەوڵەتی ئێراندا کەمایەتی بوون، ئەم جارە لە نێو دەولەتی تورکی ئازەربایجاندا ببوونە کەمایەتی.

قازی محەممەد خۆی چوە تاران و داوی لە قەوام کرد کە بیکاتە حاکمی ئوستانی کوردستانێک کە شارەکانی کوردستان و ناوچە کورد نشینەکانی ئازەربایجانیش بگرێتەوە. قەوام سەرەک وەزیری موحتاتی ئێران لە گەڵ پێشنیاری قازی موافەقەتی کرد بەو مەرجەی کە دوکتور جاویدی حاکمی دیموکراتی ئازەربایجانیش رازی بێ. دوکتور جاوید بە تورەیی پێشنیاری قازی رەت کردەوە. ناکۆکی لە نێوان کوردوکان و دیموکراتەکانی ئازەربایجاندا پەرەی گرت.

ئێستا شیاو ترین کات بوو کە تاران بە جێ بێڵم و سەرێکی ناوچەکانی ناوەندی کوردستان بدەم. لە پێشدا بریارم ئەوە بوو کە بە تەنیا لە گەڵ قەرەپێتی بێ هاوتا ی شۆفێرن بکەومە رێ. بەڵام کولونیل (ویلیام سکستن) پێی داگرت کە یەکێ لە هاو کارانی لە رادە بەدەر ئاردقخۆریش لە گەڵ خۆم بەرم. مەبەستی کولونیل ئەوە بوو کە بەڵکو لەو سەفەرە ئاردق کەمتر بخواتەوە و گۆرانێک لە وەزعیدا پێک بێ. منیش بە هاوکارە ئارەق خۆرەکەم راگەیاند بوو کە لە کوردستان ئارەق قەدەغەیە و ئەم ناوچەیە مەزهەبیە. بۆ ئەوەی بە سەر خۆشی سەفەر دست پێ نەکا، بریارم دا سەعات چواری لای بەیانی لە دەرکی ماڵێ سواری کەم، بەڵام کاتێ

گەیشتمە ماڵەکەیان دیتم دانیشتن و میواندارێ لە ماڵەکەی درێژەی هەیە. هاوکارم بە زەحمەت توانی خۆ بگەیێنێتە چیبەکە. کاتێ دیتم کە بوتڵێک شەربەتی لەگەڵ خۆی هێناوە کە جارو بار لێوی تەڕکا، خۆشحاڵ بووم. بەڵام پاشان دەر کەوت کە بەشی زۆری وۆدکایە لە گەڵ ئاوی میوە تێکەڵی کردوە. هەر چۆنێک بوو توانیمان بە بێ رووداو لە پۆستەکانی پشکنین تێپەڕین و بەرەو تەورێز باژۆین و بە ناچاری رۆژی دوایی لەوێ رابوێرین. لە کاتی مانەوەی کورتمان لە تەورێز وەزعی دۆستەکەم تاریفێکی وای نەبوو. بەڵام دیار بوو قسەی منی لە بارەی مەترسی ئارەق خواردنەوە لە کوردستان بە جیددی گرتبوو. رۆژی حەوتوی سێزدەهەمی ساڵی ١٩٤٦ لە تەورێزەوە کەوتینە رێ. جادەی تەورێز بۆ شاپور قڕ بوو لە مێگەل کە بۆ لای سەروو دەچوون. شوانەکان بە ئێمەیان گوت: مێگەلەکمان بۆ لای سنور دەبەین تا بیان دەین بە رووسەکان. هەر وا کو لە خۆیە نیزیک دەبووینەوە لوتکەی سپی چیای ئاراراتمان دەدی کە بەرەو رومان لە سەرووی رۆژئاوا بالای بەرز کرد بۆوە. وەبیرم هاتەوە کە ئەم چیایە سەر دەمێک ئافر پژان بووە.هەر بەو بۆنەوە کوردەکان پێیان گوتوە ئاگری. سرودی شەڕی کوردەکانم وەبیر هاتەوە کە ئیحسان نوری بۆی باسکرد بووم.

راست پێش ئەوەی بگەینە شاپور هەودلێن دەستەی کوردی شکاکمان چاو پێکەوت کە پێچی سوننەتیی کوردییان لە دەوری سەریان هاڵاند بوو. بە تالوکە بە نێو شاردا تێپەڕین کە پڕ بوو لە فیدایی و شکاکی چەکدار. ئەمەر خان پاش کوشتنی سمکۆ ببوە سەرۆکی عەشیرەتی شکاک و بۆ

ماوەیەک وەزیری شەڕی قازی محەممەد بوو. تەنانەت هێندێ لە عەشیرەتەکەی لە مانگی مای دا بۆ شەڕی دژی ئەرتەشی ئێران چووبوە ناوچەی سەقزیش. بەڵام دوای ئەو دەم خۆی لە قازی محەممەد دور خستبۆوە و لە گوندێکی ئاوەدانی باپیرانی ( زیندەشت) کە زۆریش لە شاپور دوور نەبوو گۆشە نشین ببوو. پاش تێپەڕ بوون لە شاپور هەوەڵێن شکاکی چاومان پێکەوت ئادریسی ئەمەر خانمان لێ پرسی. کابرا بە گومانەوە سەیری کردین و گوتی: بۆ دەبێ پێتان بڵێم ؟ پاشان کە بەوردی تێمان فکری گوتی : باشە، پێتان دەڵێم: لە لای ڕۆژ ئاوای جادە ڕێیێکی نیشانداین بە تەپکێکدا تێدەپەری بە زەحمەتێکی زۆر گەیشتینە گوندی زیندەشت ماڵی ئەمەر خانی. کوردێکی سەرو ڕوو خۆش پێشوازی لێکردین دەر کەوت کوڕی ئەمەر خانیە. ئێمەی بردە وەتاغی سەرێ. لە نێو ئەم وەتاغە دوو تفەنگ درێژ کرابوون، من هۆی ئەو کارەم نەزانی.

سەعات یەکی دوای نیوە ڕۆ ئەمەر خان نانی خوارد بوو، دوای نان چاوێکی لە سەر یەک دانا بوو. دەستەیەک کورد وەژوور کەوتن و لو جێی خۆیان دانیشتن. بەدوای ئەواندا ئەمەر خان وەژوور کەوت. پیاوێکی باڵا بەرز و خاوێن، ڕیشی تاشیبوو کڵاوێکی پەپاخی کەولی بەرخی لە سەرنا بوو. لە کاتێکا ئەوانی دەورو بەری هەموویان پێچی کوردییان لە سەر بوو. ئەمەر خان گەنجتر لە ٧٠ ساڵ دەهاتە بەر چاو کە بۆیان دانابوو. دانیشتین ئەمەر خان کەوتە دەستی ڕاستمان و لە پەنا ئەو ئێرانیەکی ڕیش کورتی قەڵەو بە لیباسێکی کۆنی ئورووپایی دانیشت. لە لای چەپمان مەلایەکی مێزەر سپی و لە وەنا ئەووا وپاوێک بە کراس و شالوار و

چەکمەی رووسی، رەش ئەسمەری وە کوردان نەچوو، دانیشت.

لە کاتێکا لە گەڵ ئەمەر خان چاک و خۆشیم دەکرد، ناسیار نامەی عەولای ئێلخانیزادەم دایە کە یەکێ لە دۆستانی من بوو لە تاران. ئەو کە نەیدە توانی نامەکە بخوێنێتەوە دای بە کورەکەی. ئەویش بە منە من خوێندیەوە بەڵام ئیمزاکەی بۆ نەخوێنرایەوە. منیش لە بەر بوونی کابرای لیباس رووسی بە چاکم نەزانی ناوی کابرای خاوەن ئیمزا بێنم.

بەم جۆرە دیار بوو نامەکە زۆریش کاریگەر نەبوو. پاشان نانیان بۆ هێناین. لە کاتی نانخواردندا دەرفەتم هێنا بیر لەوە بکەمەوە کە دەمویست باسی بکەم. چونکە بوونی کابرای بێگانە لەوێ کە کەسیش زەحمەتی ناساندنی وەبەر خۆ نەدا، زیادی دەهاتە بەر چاو. کۆسپی ئەوە بوو کە لە گەڵ ئەمەر خان بکەومە گفتوگۆ. بە چی دەزانرا کە ئەو بێگانەیە مەئموری سیاسی سۆڤیێت نەبێ کە لە نێو عێل و عەشیرەتاندا بڵاو بوونەوە.

دوای نانخواردن پرسیم: ئەوانەی لێرەن هەموویان لە عەشیرەتی شکاکن؟ ئەمەر خان وەڵامی ئەرێی دایەوە. من روونم کردەوە کە ئێمە چاو دێرانی نیزامی ئەمریکاین. دەمانەوێ لە نیزیکەوە لە گەڵ بارودۆخی ناوچە ئاشنا بین. هیواداری جۆم دەر بڕی کە ئەو بتوانێ لەم رێگایەوە یارمەتیمان بدا. لێم پرسی کە لە دەوڵەت دا چ شوێنێکی هەیە؟

لە وەڵام دا گوتی: تا رادەیەکی زۆر لە سیاسەت و سیاسەت بازی دا کوێرە وەریم دیوە. پاش چەند ساڵ زیندانی لە بەندیخانەی رەزا شادا، ئیتر لە هەموو جورە تێکۆشانێکی سیاسی دەستم هەڵگرتوە. تەنیا ویستیاری ئاشتی و هێمنایەتیم بۆ خۆم و عێلەکەم. دیار بوو کە لە وتو

وێژ لە گەڵ ئێمە خۆ دەبوێرێ و تێدە کۆشێ بە وەڵامی ناروون لە کۆڵ خۆمان کاتەوە. هەر چەندە بە ئەددبانە داوای کرد کە شەو بمێنینەوە، بەڵام تەواو ئاشکرا بوو کە مانەوەمان بۆ ئەو ناڕەحەتیە. من هەستم کرد کە بوونی بانگ نەکراوی ئێمە بۆ مەجلیسی ئەو لە بار نیە کۆسپی ئەم وتو وێژەشێن کە رەنگە لە گەڵ دێموکراتەکان بیکا. .مالاواییمان بوو بە هۆی گرژی، چونکە کاتێ وەدەر کەوتن لە وەتاغ بە سەر ئەم دوو تفەنگەی درێژ کراودا هەنگاومان هاویشت و گۆیا ئەمە کارێکی دژ بە دابی ئەوان بوە. چونکە کوردەکان بە گرژی و بە حالەتێکی نە زۆر دۆستانە بەرێیان کردین.

لە زیندەشت بۆ لای ورمێ بە نێو گوندی ئاسۆری یەکاندا تێپەڕین کە بە بزەی سەر لێو دەستیان بۆ رادەوەشاندین. دیار بوو پاش دوو ساڵ کە چاویان بە ئەمریکایی دەکەوێ پێیان سەیر دەبێ. کە گەیشتینە شار چووینە بارەگای ( محەممەد تەقی رەفیعی) فەرمانداری شار. رەفیعی پیرە مێردێکی کورتە باڵای رێز دار بوو بە موی تەنک و ماشو برنجی. ئەو کە خۆی خاوەن ملکێکی دەولەمەند بوو، پێشتر لە وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئێراندا خزمەتی کرد بوو. لە زەمانی رەزا شادا ئەندامی پارلمان ببوو. کاتی هاتنی هێزی هاو پەیمانان لە رووسەکان نیزیک ببۆوە، ئەوانیش لە رەوەندی هەڵبژاردندا پشتیوانیان لێکرد بوو. دوای (شۆرشی) دێموکراتەکان ببوە نایبی سەرۆکی مەجلیسی خەڵکی ئازەربایجان. لە کاتی وتو وێژدا تووڕە و هارۆژاوم دەبینی. جارێک کاتی لە باردی تێکۆشانی دەوڵەتی ئەمریکا بۆ پێشگری لە ساز بوونی شەڕی سێیەمی دنیا گر وتەیێکم بە سەر زماندا هات، ئەو گوتی: ( هەمووی

ئەوانە بەستراوەتەوە بە مەیل و ئیرادەی ئێوە). من لە وەڵام دا گوتم: پێم وانیە هەموو شت بە دەست ئێمە بێ. ئێمە هەموو تەقەلایەکمان داوە و زیاتریش. ئێستا بەسترلوەتەوە بە مەیل و ئیرادەی هێزەکانی دیکە. ئەو هێزانەی کەوا دێتە بەر چاو کە ئامانجیان تەنیا پەرە پێدانی ئەرز و وەدەست خستنی سەر زەمینی زیاترە)

من گوتم: هەر چەندە میللەتی ئەمریکا ویستیاری ئاشتی و هێمنایەتیە، بەڵام قەت ئامادە نیە کە تەماشاچی بێ لایەنی توانای تەرەفی خۆی بێ بۆ زۆر وێژی و دەسەڵات سەپاندن بە سەر جیهاندا. ئەو کە لە رەوەندی وتو وێژدا نارەحەت و نیگەران ببوو، دیار بوو بە ساز بوونی نان و برانەوەی قسان هاتەوە سەر خۆ.

کاتێکی چووینە ژووری میوانداریی فەرماندار، لە گەڵ پیاوێکی موو رەشی کورتە بالای گورج و گۆلی بە ئونیفۆرمی ژەنرالی بەرەو روو بووین. دەر کەوت ئەوە کولونێل ئازەر و یەک لە ئەندامانی پێشووی ستادی گشتی ئەرتەشی ئێرانە کە پەنای بۆ ئازەربایجان هێناوە. لە پاشان دوای چەند مانگ دانیشتن لە سۆڤیێت بۆ وەر گرتنی فەرماندەری نیزامی هاتۆتە ورمێ. ئەو پاشان بۆی باسکردین کە کوری یەکێ لە شۆرشگێرانی دەیەی ١٩٢٠ی ئازەربایجانە و رۆژەکانی گەنجیەتی لە گەڵ بابی دوور خراوەتەوە بۆ خوراسان. ئەو کە هەموو نیشان و خاسیەتی کۆمونیستێکی دوو ئاتەشەی هەبوو، بە پێچەوانەی فەرماندار فەرانسی زۆر باش دەزانی. لە مەدرەسەی نیزامیی فەرانسە خوێند بووی لە باردی کولتوری ئێرانی و ئورووپایی موتالایەکی قوولی هەبوو. ئەو وەک فەرماندار لە وسە کردندا بە

پارێز و بە هەست نەبوو. کاتی خواردن و خواردنەوە و دوای ئەویش وتو وێژەکەمان سەرنج ڕاکێش بوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەڤینی ئەو بوو بە ئەدەبیاتی فارسی. بە ڕای ئەو فیردەوسی گەورەترین شاعیری جیهانە. نوسخەیەکی پچوکی لە گولستانی سەعدی لە گیرفانی داهوو هێنایە دەر ونیشانی دام و گوتی: ( کاتێکی خەمبار دەبم گولستان دەخوێنمەوە دێمەوە سەر خۆ). دەیگوت ئێمەی ئازەربایجانی خۆمان بە ئێرانی دەزانین و ڕەگەزیشمان پتر ئێرانیە. بەڵام دەمانەوێ مافی ئاخافتن بە زمانی تورکی خۆمان هەبێ. هەر چەند ئەو زمانە لە لایەن تایفەی پەلامار دەری ئاسیای پچوکەوە بە سەرماندا سەپێنرا بێت.

وتو وێژمان تا ئەو بەشە خۆش و سەرنج ڕاکێش بوو بە تایبەت لە گەڵ کۆلۆنێل ئازەری بە هۆش. بەڵام کاتێکی باسی سیاسەتم هێنا گۆڕێ. کۆلۆنێل ئازەر هەر ئاو ئامانج و مەبەستەکانی ڕووسانی وەک توتی دوو پات دەکردەوە- چەپەڵی ژیان لە ئەمریکا ، تەفاوەتی نێوان دێموکراسی ڕۆژ ئاوا و دێمۆکراسی بە قەولی ئەوان ڕۆژ هەڵات.

مەسەلەیەکی بە ئاشکرا ئەو وفەرمانداری پەرێشان کرد بوو مەسەلەی کوردەکان بوو. من بە وانم گوت لە لایەن کار بەدەستانی تەورێزەوە ڕێگامان درا بوو تەنیا تا ورمێ بێین. هەر بەو دەلیلە هاتووینە سەر ئەو باوەڕە کە لێرە بە دواوە لە ژێر کۆنترۆلی کوردان دایە. ئازەر گوتی ( بەڵێ وایە. لانی کەم ئێستا وایە.)

پێم گوتن بیستوومە فەرمانداری نەغەدە لە ورمێ یە. پرسیم ئەو یا کورددکانی دیکەی شار دەسەڵاتێکیان هەیە؟ ئەو لە وەڵام دانەوە خۆی

بولرد. تەنیا گوتی : بە راستی ژمارەیەکی کەم لە کوردان لە شاریدا هەن.

پاشان لە گەڵ فەرماندار دەستی کرد بە تورکی گوتن. ئەوان دەیانزانی کە ئێمە تورکی نازانین. وتو وێژی ئەو شەوە بێ ئەوەی نەتیجەیەکی هەبێ کۆتایی هات. پێش ئەوەی بچینە سەر جێ، قەرەپیت گوتی: ( ئاگا داری پێوەندی خانە خوێمان بوە لە گەڵ کونسولگەری سۆڤێت، رەنگە بۆ وەر گرتنی رینوێنی بووبێ. لە وانەیە لە ئەسڵ دا ویستبیان رووسەکانیش بۆ نانخواردن داوەت بکەن، چونکە دوو کورسی بەتاڵ لە دەورەی مێزی خواردن بوون.

رۆژی دوایی کۆلۆنێل و فەرماندار بە دڵ هەولیان دا کە لە ورمێ بمێنمەوە. بەڵام کاژێ گوتم : بریارم ڤاوە سەفەر درێژە پێبدەم، کۆلۆنێل خۆی تا ئاڵاتیش نیزیکەی ١٥ کیلۆ میتر لە خواروی ورمێ لە گەڵمان هات. لەوێ ماڵاواییمان لێکرد و بێ نوودوا لە پاسگەی پشکنین تێپەڕین. سەر بازەکانی پاسگە بە لیباسی ئۆنیفۆرمی دەکار کراوی رەنگ رۆیشتوو وەک زانیمان لە عێلی هەرکی زێرۆ بەگی بوون. لە درێژە پێدانی رێگامان بۆ لای خواروو لە رۆخی دەریا لە پاسگەیەکی دیکەش ردت بووین و پاشان بۆ لای رۆژ ئاوا و سنوری عیراق بۆ دیداری عێلی مامەش بامان داوە کە لەو لاتەدا لە گەڵ قازی محەمەد ناکۆکیان هەبوو. کاتێ گەیشتینە چوار رێی نەغەدە مەجبور بووین بۆ بنزین راوەستین. کامیۆنێکی بار و گواستنەوەی ئێران - سۆڤێت لە پێش ئێمە وێستا بوو. پاشان ددر کەوت کە ناسۆری و ناوی (جۆرج)ە و خاوەن کارلژی نەوتیە. سەرە رای دوو قەتڵ سەباردت بە پشتیوانی رووسەکان لە سزادان رزگاری هاتوە.

پاش ئەوەی بە حاڵەتێکی دوژمنانە بە سەرماندا هات، بە ناکامی ویستی بە رووسی لە گەڵ قەرەپێت بدوێ. چەند پۆلیس لەوێ وێستا بوون. رووی تێکردن و گوتی: ( رێگا مەدەن ئەوانە بڕۆن، بیان بەن بۆ ئیدارەی پۆلیس). ئێمەیان بردە ژێر زەمینێکی گەورە دیا بوو دەفتەری سەرۆکی پۆلدسە. دیوارەکانی بە عەکسی ستالین و مۆلۆتۆف و دەستبەندێک و قامچیەک رازابۆوە. ئێمەیان لەم ژووورە تەنیا هێشتەوە و رۆیشتن. ئێمەش پاش تاوێک چاوە روانی هاتینە دەر و بۆ لای جیبەکەمان چووین. کورج کوردەکان دەورەیان داین. ئێمە خۆمان تورە نیشاندا. کوردێکی زەلامە لە نێو خەلک هاتە دەر وگوتی:( دەیەوێ بۆ نانخواردن لە گەڵ فەرماندار، سەید ئەحمەدی برای پوشۆ داوەتمان بکا. سەید ئەحمەد لە شاری نەبوو. بەلام گوتی : تەلیفون دەکا بۆ ماڵی سەید ئەحمەد. داوای کرد کە خولردنمان بۆ ساز بکەن. من گوتم ئێمە زیندانین و داوەتیش قەبووڵ ناکەین. کابرا گوتی :( ئیختیارت هەیە. ئێوە میوانی ئێمەن).

گوتم : ئەگەر میوانین سوپاستان دەکەین و دەمانەوێ بۆ مەهاباد برۆین. ئەو گوتی : نابێ. فەرموون لە گەڵ من بۆ ماڵی سەید ئەحمەدی. گوتم : دلبی میوانداری ئێوە وەک خەلکی دیکە نیە. تا لە بەغدا بووم ئەوان زۆر بە میهرەبانی ردفتاریان دەکرد.

عەرەبەکانی ئەوێ دەیانگوت: کوردەکان خەراپ و شەرەفیان نیە.ئەو دەم باوەرم بە قسەی ئەوان نەدەکرد، بەلام ئێستا دەر کەوت کە وایە، ئەو قسانە کوردەکانی نارەحەت کرد، کوردێکی زەلامی بە خۆوە دەهات کە بگری. بە دوای قسەکانمدا باسنک ساز بوو، ئەوان لە سەر قابی

میوانگری رۆژ هەڵات پێیان دا دەکرت. پاشان پیاوێکی رەش ئەسمەر کە ئونیفۆرمی ئەرتەشی رووسی گەبەر دابوو هاتە پێش و بە ئاهەنگێکی خۆ شیرین کردن خۆی بە سەرۆکی پۆلیس ناساند و گوتی ئێوە ئازادن هەر کاتێ بخوازن بۆ هەر کوێ دەتانەوێ دەتوانن برۆن بۆ مەهاباد نەبێ. بۆ چوونی مەهاباد دەبێ ئیجازە وەر گرین.

پرسیم دەکرێ بە جادەی رۆژ ئاوادا برۆینە پێش؟ چونکە هێشتا هیوا دار بووم بتوانم یەکێ لە عەشیرەتەکانی ئەو ناوچەیە ببینم. لە وەڵامدا گوتی : دیارە دەتوانی. بەڵام لە بەر نا ئەمنی رێگا دەبێ پۆلیستان لە گەڵ بنێرین. لەبەر ئەوە کە دژوار بوو بتوانین چاومان بە تایفەی مامەشی موخالیف بکەوێ، پێشنیاری چوونی شنۆیەم کرد. سەرۆکی پۆلیس قەبولی کرد و امان ئیشاندا کە داوای لێبوردنی ئەوان ئارامی کردووین و ئەوەندە هاتووینەوە سەر خۆ کە بتوانین داوەتەکەیان بۆ خواردن و خواردنەوەی پیاڵە چایەک لە ماڵی سەید ئەحمەدی قەبوڵ بکەین. بە درێژایی رێگا یەکێ لە پیاوەکانی سەید ئەحمەدی کە لە گەڵمان هاتبوو سەبارەت بە رەفتاری ناحەزی هاو شاریەکانی داوای لێبوردنی دەکرد.

لە سەر رێگای شنۆ چاومان بە چەند پیاو وکوری گەنج کەوت لە عئلی بارزان کە کراسی رەنگ خۆڵەمێشی تایبەتیان لە بەر دابوو. کاتێ گەیشتینە شار بە نێو بازاری تاریکی سەر داپۆشراودا تێپەڕین و گەیشتینە ساختمانی دەوڵەتی. چەند کەس بە لیباسی رەنگ ئەرتەشی بە نیشانەی ئیحتیرام پێش فەنگیان کرد. ئەوان داوایان لێکردین کە چاومان بە موسا خانی زەرزا سەرۆک عەشیرەتی زەرزا و شارداری شار

بکەوێ. ئەو پیرە مێردێکی سەر زیندوو بوو، بە زارێکی پڕ لە ددانی زێڕ بە حوکمی میوانگری مەجبوری کردین بچین لە ماڵی ئەو نان بخۆین. هەر چەندە ناچار بووین بگەڕێینەوە لە ماڵی سەید ئەحمەدیش فراوین بخۆین. خانم و دایکی سەید ئەحمەدی داوەتیان کرد بووین. ئاخرەکەی دوای دوو جەم خواردن کە ورگمان ئاوسا بوو ئیجازەی سەفەر مان بۆ مەهاباد وەر گرت.

شاری مەهاباد پڕ بوو لەو کوردانە کە هەموو جلی کوردیان لە بەر دابوو. ئێمەیان بۆ شارداری ڕێنوێنی کرد و لە گەڵ مەئمورەکانی مەحەللی بووینە ئاشنا. ئەوان گوتیان کە قازی محەممەد بۆ لای خۆی قەبوڵمان دەکا. مەئمورەکانی شارداری ئەو شەوە بۆ شێو خواردن داوەتیان کردین. بەر پرسی تەبلیغات سەدیق حەیدەری ڕەگەڵمان کەوت. ئەو پیاوێکی روو خۆش و تاقە ئەندامی کابینە بوو کە بە ئارەق خۆر مەشهور بوو. ئەفسەری هاو سەفەری منیش بە ئیشتیایەکی تەواو بۆ چەند گیلاس ودکا هاو ڕێیی کردین.

رۆژی دوایی هەوڵی وەخت بۆ خانوێک ڕێنوێنی کراین کە دیار بوو رووسەکان کاتی خۆی بۆ ئەرتەشی تازە دامەزراوی مەهاباد وەک بارەگای فەرماندەیی کەلکیان لێ وەر گرتبوو. دیوارەکانی ئەو بینایە پڕ بوو لە تەبلیغاتی کۆمونیستی و رەسمی ڕێبەرانی سۆڤیێتی. کاتێ لە دەفتەری قازی محەممەد وە ژوور کەوتین ئەو لە پشتی مێز لە پەنا ئەخشەیەکی گەورەی کوردستانی مەزن دانیشتبوو. قازی محەممەد پیاوێکی ڕێز داری کورتە بالا، کۆتێکی دەکار کراوی سەر بازی لە بەر دابوو. لە هەر تک لا

رومەتی رەنگ پەریوی زاهیدانەی ریشێکی تەنکی کەم موو روا بوو. ئەو پاشان بە ئێمەی گوت: لە بەر نەخۆشی مەعدە نارەحەتە و جگە لە ماست بە هەڵکەوت شتێکی تر دەخوا.

پاش ئەوەی بۆمان روون کردەوە ئێمە کێین و مەبەستی سەفەرەکەمان چیە، پارچە کاغەزێکی لە سەر مێز هەڵگرت و قسەکانی لە پێش ئامادە کراوی بە فارسی خوێندەوە. وشەکانی تەواو روون ودەنگی ئارام بوو. لە کاتی خوێندنەوەدا جار وبار بە چاوی ریازەت کێشانەی سەیری دەکردین.
من لە وەڵامی قسەکانیدا گوتم: وڵاتە یەکگرتوەکان هەمیشە لایەنگری ئازادی و کەلک وەر گرتنی گشت ئادەمیزادانە لە مافی مرۆڤ. ئێمە هیواداریین کە رۆژێک تەواوی خەڵکی دنیا بە ئامانجی خۆیان بگەن. ئێمە هاتووینە کوردستان تا لە وەزعی کوردوکان بکۆڵینەوە و راپۆرتی خۆمان بدەینەوە بە دەوڵەتمان. هیواداریین کە وەزعی کوردەکان باشبێ و کوردەکان جۆرە سەرەرۆییێک بە جۆرێکی تری سەرەرۆیی نە گۆڕنەوە.

قازی محەممەد گوتی: (تەواوی ئەو خەڵکەی لەو بەشانەی وڵات کە لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی من دان لە دەر برینی بیر و وتاریان ئازادن.) من لە وەڵامدا گوتم :( خۆم بە چاو ئەودەم دیوە کە وایە. لە ئازەربایجانی دێموکرات خەڵک دەتوانن تەنیا گوێ بدەنە رادیوی تەورێز و مۆسکۆ. لە کاتێکا دوێنێ شەو لە شەقامەکانی شاری مەهاباد گوێم لە دەنگی رادیوی ئەنکاراو لەندەن بوو.)

قازی محەممەد کە دیار بوو ئەو قسەی منی پێ خۆشبوو گوتی: وەزعی تەورێز لە گەڵ مەهاباد فەرقی هەیە. بەڵام کاتێ لە گیر و گرفتی ئێمە لە

سنوری دەوڵەتەکەی ئاگادار بوو شادی لە سەر روومەتی و دلا چوو. هەر وەها کاتێ گوتم لەوە سەرم سوڕ دەمێنێ کە دەبینم بارەگای فەرماندەیی ئەو بە پۆستەری تەبلیغاتی سۆڤیێتی داپۆشراوە. ئەو گوتی: ( کوردەکان ناچارن هەر کەس یارمەتیان پێ بکا لێی قەبوڵ بکەن. بەڵام ناچنە ژێر باری هیچ دەسەڵاتێک. ئێمە کوردەکان سکالایەکمان دا بە سێ دەوڵەتی سەر کەوتووی بەشداری کۆنفرانسی پۆتسدام. بەڵام ئینگلیز و ئەمریکا گوێیان نەدایە. ئەو لە گەڵ ئاماژە بۆ بەیاننامەی ئاتلانتیک گوتی: کوردەکان هەموو هیوادار بوون وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا - پێشکەوتو ترین وڵاتی جیهان - بۆ سەر کەوتن بە سەر دوا کەوتوویدا یارمەتیمان بدا.
پاشان گوتی : ئەگەر ئەمریکا لە جێگای ناردنی سی هەزار سەر باز بۆ ئێران تەنیا سەد ماموستای بۆ ئەم وڵاتە نارد بایە چی دەبوو؟ بەڵام ئەمریکاییەکان لە جیاتی یارمەتی بە ئێمە یارمەتی بە دوژمنانی ئێمە - تورکەکان - دەکا، ئەوەش لە ڕێگای دانی چەک و قۆرخانە بۆ سەر کوت کردنی کوردەکانی ئێمە.) پاشان لە سەر کۆنەی ئینگلیزەکان و تارێکی دا و لە درێژایی دەیەکانی رابردوو کردەوە جیاوازەکانی ئینگلیزی بۆ سەر کاتکردنی شۆڕشگێرانی کورد ئەژمارد و بە کارەساتی مەلا مستەفا کۆتایی پێ هێنا. لە لایەکی دیکەوە لە سەر فەرانسیەکان بیر و رای باش بوو. فەرەنسی کە یارمەتی کوردەکانی سوریان دابوو. پاشان بیستم کە ( ناپلئون ژاکل) یەکێ لە هەواڵدەرانی فەرانس پرێس کە بیر ورای چەپی هەبوو لەو دواییانە دا سەفەرێکی مەهابادی کردوە و بە دوای ئەودا زنجیرە وتارێکی بۆ دیفاع لە کوردەکان لە چاپەمەنی فەرانسەدا بڵاو کردۆتەوە.

قازی محەممەد پاشان لە باری تێکۆشانی ناسیونالیستی لە وڵاتانی دراوسێدا قسەی کرد. بەڵام کاتێ لە بارەی مەلا مستەفاوە کە وا قاو بوو دەگەڕێتەوە بۆ عیراق پرسیارم لێکرد، لە وەڵامدانەوەی راستە ڤینە خۆی بوارد.

لە بارەی وتو وێژ لە گەڵ دەوڵەتی عیراق شتێکی گوت و لێی زیاد کرد کە مەلا مستەفا ئازادە و هەر کاتێ بخوازێ بچێتەوە عیراق. کاتێکی داخوازی چاو پێکەوتنم لە گەڵ مەلا مستەفا و یا ئەفسەرانی هاو ڕێی ئەو دەر بڕی، جوابی نەدامەوە.

قازی محەممەد لە پاشان سەبارەت بو وتو وێژی لە گەڵ دەوڵەتی ناوەندی و پێشنیاری پێک هێنانی ئوستانێکی کوردستانی گەورە قسەی کرد. ئەو ئیدیعای دەکرد کە هاندەری ئەم پێشنیارە خودی دەوڵەتی ناوەندی بوە. گوتی دوای گفتگۆ لە گەڵ من و دوکتور جاوید بڕیاری داوە ئەم پێشنیارە قەبوڵ بکات. ئەو گوتی: حیزبی دێموکراتی کوردستان هێشتا بڕیاری نەداوە کە داخوا پێشنیاری قەوام لە بارەی چوونە نێو حیزبی تازەی دێموکراتی ئێران قەبوڵ دەکا یان نا؟ ئەو هەر وەها ئاماژەی بۆ ئەو گیر و گرفتە کرد کە عەشیرەتە موخالیفەکان بۆیان ساز کردوە. قسەکانی بە دەر بڕینی بیر وڕای گشتی لە بارەی سەر کوت کردنی کوردەکان لە لایەن ڕەزم‌ئارا شاوە کۆتایی پێ هێنا.

دوای وتو وێژ لە گەڵ قازی چووینە گەڕانی نێو شار. دەرفەتێکی زۆر بۆ قسە کردن لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵک هەڵنە کەوت. چونکە تەواوی ئەو ماوەی کە لە مەهاباد بووین لانی کەم یەک لە ئەندامانی کومیتەی

ناوەندی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان لە گەڵمان بوو. ئێمە لە دەردوەی ئەم جەغزە لە گەڵ کەس نەبووینە ئاشنا. بەڵام شۆفێری ئەرمەنی ئێمە کە لە نێو شار سوڕا بۆوە دەیگوت: لە سەرەتاوە خەڵک وای زانیبوو کە ئێمە رووسین و پرسیبوویان رووسەکان بۆ گەراونەوە. کاتێ پێیان گوتبوون کە ئەمریکایین کەیف خۆش ببوون و ئاواتیان بوو کە ئامریکا کوردەکان باش بناسێ. ئەر چەند ئێندێکیان لە ئاست ئامانجی دیداری دوو ئەفسەری ئەمریکایی کەوتبوونە گومانەوە. بە گشتی خەڵک لە قازی محەممەدی رازی بوون و دویانگوت: دامەزرانی دەولەتی ئەو دوای رمانی حکومەتی رەزا شا سەر کەوتنێکی گەورە بوە. تەنیا لە بارەی بەر دەوامی ئەو دەولەتە نیگەران بوون.

من لە راپۆرتەکەم دا بیر و رای ئەندامانی کومیتەی ناوەندیم کۆ کرد بۆوە. ئەوان بەر منەتی سۆڤیێت بوون کە دەرەتانی سەر بە خۆیی بۆ پێک هێناون. لە سەر دەست تێوەر نەدانی سۆڤیێتیەکان لە کار و باری ولاتیان و نە بوونی مەئمورەکانی سۆڤیێتی لە شارەکەیان پێیان دادەگرت. زوربەی ئەو کەسانە دیار بوو هەوادارانی ئەشرافیەتی کۆن بوون و وا نە دەهاتە بەر چاو کە مەیلیان بە لای کۆمونیزم دا هەبێ. ئەوان خۆیان لە وەزعێکی شۆرشگێری دا دەبینی، بەڵام شۆرشێکی ناسیونالیستی. ئەوان دویانگوت : هیوا دارین حکومەتەکەیان ئەوەندە پەرە بستێنێ کە هەموو ناوچە کورد نشینەکانی ئێران بگرێتەوە. ئەم ناوچانە ناوچەی خوارووی ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی ئێرانیشی دەگرتەوە. تەنانەت شوێنی دانیشتنی لور و بەختیارەکانیش کە خۆیان بە کورد نەدەزانی، لە لای سەرووی کوردستانی

گەوری بەشێکی ئازربایجان و لە خوارو وڕۆژ هەلاتی گۆلی ورمێ تا سنوری سۆڤیێتیشی دەگرتەوە.

ئەندامانی کومیتەی ناوەندی سەبارەت بە بوونی سەربازی زۆری ئێرانی لە ناوچەی خوارو وڕۆژ هەلاتی گۆلی ورمێ نیگەران بوون. لانی کەم یەکێ لەو ئەندامانە ئاماژەی بۆ پیلانگێرانی دەولەتی ناوەندی کرد لە گەل هێندێ عەشایری کورد.

بەیانی ١٦ی سێپتامبر چوومە سەردانی چاپخانەی مەهاباد کە رۆژنامەی رۆژانەی کوردستان و هێندێ گۆڤاری کەم تیراژی زمانی کوردی یان بلاو دەکردەوە. زمانی کوردی بە کورتی دوو زاراوەیە. یەکەمیان لەهجەی (زازا)یە کە زاری کوردەکانی سوریا و تورکیا و ناوچەکانی سەرووی عیراق و عێلی هەرکی و شکاک و کوردەکانی سەرووی ئێرانە. بەدرخانیەکان بە کەلک وەر گرتن لە ئەلفو بێی رۆمی، شێوە نووسینێکیان بۆ ئەم بارە داهێنا کە لە سوریا بە کاری دێنن. لەهجەی دیکە کە زاری زۆربەی کوردەکانی عیراق و ئێرانە و فەرقێکی گەورەی لە گەل زاری یەکەم هەیە. ئەم زارە بە جۆرە ئەلفو بێیێکی عەرەبی دەستکاری کراو دەنووسرێ. لەم شێوە نووسینەدا لە پیتی دەنگدار کەلک وەر دەگیرێ و زمانی بە کار هێنانی ئەم کتێب و بلاو کراوانەیە کەلە مەهاباد و بەغداو سولەیمانی بلاو دەکرێنەوە.

مودیری چاپخانە ماشێنێکی نیشانداین لە چەشنی روتاریی و دەستکاری رووسیا بوو. هەر چەندە هێندێ لە پارچەکانی مارکی ئەلمانی و چێکوسلۆڤاکییان هەبوو. ئێمە لە هەموو ژمارەکانی کوردستان لە

سەردتای دەر چوونیەوە و چەند گۆڤار و چەند دیوانی شێعرمان ئامادە کرد و دامان بە بەر پرسی ئتیلاعات. هێندێ لەو نوسخانەم داون بە کتێبخانەی کوردی لە شاری نیویورک.

کەمێک دوای ئەودی کوردەکان لە قەستی رۆیشتنمان ئاگادار بوون، پێیان راگەیاندین کە قازی محەممەد بۆ فراوین داوەتی کردووین. ناچار بووین سەفەرەکەمان بۆ دوای نیوە رۆ وەدوا بخەین. نیزیک نیوە رۆ ئێمە دوو بارە لە دەفتەرەکەیدا لە گەڵ قازی وتو وێژمان دەکرد. ئەمجارە قسەکانمان پتر لە بارەی کولتورەوە بوو. ئەو گوتی : پێم خۆشبوو کە ئێوە نوسخەی بڵاو کراوەکانی ئێمەتان وەر گرتوە. چونکە دەمەوێ وڵاتە یەککرتوەکان لە بارەی کوردستانەوە هەموو شت بزانن. من هیچ شتێکم بۆ شاردنەوە نیە. من گوتم :( کە وابو بۆچی مودیری تەبلیغات ئاخرین ژمارەی رۆژنامەی کوردستانی لێ وەر گرتینەوە.؟ قازی نوسخەیەکی لەو ژمارەیە هەڵگرت و سەر خەتێکی نیشاندام کە پێوەندی بە ئەنجومەنی ئەیالەتی کوردستانەوە هەبوو. گوتی : ئەمە هەڵەیێکە تورەی کردووم. ئەیالەتی کوردستان وجودی نیە. ئێمە بەشێکین لە ئازەربایجان و من نامەوێ ئەم نوسخانەی ئەم هەڵەیان تێدایە بڵاو ببنەوە. ئەمە بە تەواوی نیشاندەری سیاسەتی ئەو بوو. عنوانی ئەو تەنیا پێشەوا بوو. بە مانای رێبەر. بەر پرسی وەزارەتخانەکانی ئەو سەرۆک ناو دەبران نەک وەزیر.

وەک لە دیتنەکان دەر کەوت ئەو هێشتا خۆی بە مەئموری ئێرانی دەزانی و بە کردەوە ئامانجی وەدەست هێنانی خود موختاری بوو لە نێو سنورەکانی ئێراندا. ئەو پێی دادەگرت کە کورد و ئێرانی خزمن و لە باردی

ڕەگەزی کوردەکانەوە داوای دەکرد کە لە پاشماوەی مادەکانن. لە گەڵ قازی و هاو ڕێکانی فراوینمان خوارد. وەک زێندەییک وۆدکایەکی شازیش ئامادە کرا بوو. تەنیا یەک دوو کەس لە بەشداربوان یارمەتیان داین. نیزیکەی سەعاتی سێو نیو دوای نیوە ڕۆ لە گەڵ کوردێکی زەلامەی خەڵکی مەهاباد کەوتینە ڕێ و پاش تێپەڕیوون لە جادەیەکی شاخاوی بە نێو بۆکاندا تێپەڕین و کاتێ گەیشتینە خەتی جەبهەی هەوا تاریک ببوو. لە پڕ چاو ساخەکەمان هاواری کرد، ڕاوەستن ! سێ پێشمەرگە هاتنە پێش و بردیانین بۆ لای ئەمیر خانی فەرماندەیان کە بارزانی بوو. ئەمیر خان لە هەوەڵەوە گوتی: ئیجازەی نووسراوتان لە لای پێشەواوە پێ نیە، ناتوانم ڕێگاتان بدەم. بەڵام پاشان فەرقێکی بۆ ئێمە داناو بە بزەیەکی دۆستانە بەرێی کردین. چەند میل لەو لاتر ڕێبەندانێکی دیکەمان هاتە پێش. دوای ماوەیەک زیقەی ترومبیل سەر و کەللەی دوو سەر بازی ئێرانی پەیدا بوون. یەکیان کاغەز و قەڵەمێکی بە دەستەوە بوو ناوی ئێمەیان نووسی و ژمارەی تفەنگەکانیان پرسی و ئێمەش چوار ژمارەی ساختەمان پێگوتن. شەو لە سەقز لە گەڵ ژەنراڵ هومایونی ڕامان بوارد. تامە زرۆ بوو کە بیرورای ڕێبەرانی مەهاباد سەبارەت بە عەشیرەتەکانی دژی قازی محەممەد بزانێ. ئەو گوتی سەرۆک عەشیرەتەکانی مامەش و مەنگوڕ ونوێنەری گوڕانان ڕۆژی پێشتر هاتوونە لای داوای چەک و یارمەتیان لێکردوە.

لە کۆتایی سەردانەکەمدا ئیتر قەناعەتم هاتبوو کە قازی محەممەد بە یارمەتی رووسەکان توانیویەتی کۆمارێکی کوردی بە ڕاستی سەر بەخۆ دابمەزرێنێ. هەر چەندە قازی بە چاوی باشترین دۆست سەیری رووسەکانی

دەکرد، بەڵام رووسەکان بە ئاشکرا دەستیان لە کار و باری نێو خۆی کوردستان وەر نەدەدا. راپەرینی قازی محەممەد راپەرینێکی ناسیونالیستی بوو، نەک کۆمونیستی. ئەژمارێکی زۆر لە کوردوکانی دانیشتووی وڵاتانی دیکەش قەبوڵیان بوو. بەڵام سەرەرای ئەم وەزعەش عەشیرەتە گەورەکانی کوردی ئێران یا دژی بوون و یاله ئاست راپەرینەکە لا لوت بوون. ئەمەر خان دوو حەوتوو دوای چوونی من بۆ زیندەشت روژی ٢٧ی سپتامبر لە هەرەشەیەکدا بە فەرمانداری شاپوری راگەیاند کە ئەگەر دەوڵەتی ئازەربایجان بە ویستی کوردەکان رانەگات، رۆژی ٣٠ی سپتامبر ئەو بە هێز و زۆر داری شار دەگرێ. بەڵام هەرەشەی هاشمۆڤی کونسولی سۆڤیێتی ئەمەر خانی سارد کردەوە،

هەر لەو رۆژەدا (جیری دوهیر) کونسولی ئەمریکا لە تەورێز نامەیەکی لە ئەمەر خانەوە بۆ هات کە بینێریٚ بۆ قەوامی سەرۆک وەزیر. ئەمەر خان لە نامەکەدا وەفا داری خۆی بەرانبەر حکومەتی ناوەندی راگەیاند بوو.

وادیارە هاندەری ئەم هەنگاوەی ئەمەر خان فیلمێک بوە لە کاتی وتو وێژی شاپوردا رووسەکان نیشانیان داوە. فیلمەکە لە بارەی وەرزێران و ئاگر تێبەردانی خانو بەردی خاوەن ملک و پێک هێنانی کۆمونی شۆرشگێری بوە. ئەمەر خان دوای گەرانەوەی بۆ زیندەشت و چاو پێکەوتنی لە گەڵ کەسانی عەشیرەتەکەی خۆی بە قورئان سوێند دەخوا کە دیموکراتەکان وەدەر بنێ.

لەو کاتەدا عەشیرەت و کەسانی دیکەش هەستیان کرد بوو کە با لە کام لاوە دێ. چونکە هێزی تێگەیشتنی ئەوان پاش چەند سەدە کێشە و

تەقەلا بۆ مانەوەیان لە نێو دەسەڵاتدارەکاندا زیاتر گەشەی کرد بوو.
رووسەکان دەستیان لە ئازەربایجان هەڵگرتبوو. بە هۆی دژایەتی سەر سەختانەی ئەمریکاوە نەخشەی پەلامار دەرانەیان بۆ دەست بە سەر داگرتنی تورکیا و یونان و ئێران لە بیر خۆ برد بۆوە. هەر لە وەی ئێمە ئەم راستیە بە تەواوی بزانین، سەرۆک عەشیرەتەکان بە یارمەتی هەستی شە شەم ئەوەیان هەست پێکرد بوو. لە ئاخری مانگی نۆوامبر دیار بوو کە دەولەتی ئێران بۆ چاوە دێری بە سەر هەڵبژاردندا بریاری داوە لەشکر بۆ ئازەربایجان بنێرێ. هێزیکانی ئێران هەوەڵین هەنگاو زەنگانیان گرت.

رۆژی پێنجی دیسامبر قازی محەممەد و یارانی هەڵکەوتووی کۆ بوونەوە و بریاری بەر بەرەکانیان دا. بەڵام رۆژی دوایی سەدری قازی برای قازی محەممەد نەیتوانی حیزب وسەرۆکەکان رازی بکا کە ئەرتەشی ئێران بە راستی هەر بۆ سوکایەتی و ئەو بە کەم گرتنە دەبێ کە کوردەکان وەپاڵیان داوە. دیار بوو کوردەکان لە ئاڵوگۆری ئازەربایجان دەرسیان وەر گرتبوو، لە گەڵ پێشرەوی ئەرتەشی ئێران لە دۆڵەکانی قافلانکۆ هێزی دێموکرات و دام و دەزگای دەولەتی ئازەربایجان لە ماوەیەکی کەمدا تێک تەپی. قازی محەممەد و پێرەوانی زانیان کە یاری تەواو بوە. عەشیردتی شکاک و هەرکی بە مەیل و داخواز بۆ پەلامار دانی دێموکراتەکانی رۆژئاوای گۆلی ورمێ ڕدگەڵ هێزی دەولەتی کەوتن.

بارزانیەکان بۆکانیان بە جێهێشت و پاش ماوەیەکی کورت ژەنرال هومایونی لە میاندواو خەریکی رێبەرایەتی کردنی عەمەلیات بوو.
کوردەکان وەفادار ما بوونەوە. نە توانای شەریان هەبوو نە دەیانتوانی بە

راکردن خۆیان رازی بکەن. بە ناچار رێگای تەسلیم بوونی شەرافەتمەندانەیان هەڵبژارد.

رۆژی ۱۳ی دیسامبر قازی محەممەد و سەدری قازی و سەیفی قازی لە میاندولو تەسلیم نامەی خۆیان دا بە ژەنراڵ هومایونی. هەر چەندە ژەنراڵ یەک دوو پرسیاری قورسی سەبارەت بە وەفاداری قازی بە دەوڵەتی ناوەندی لە قازی کرد، بەڵام لە سەر یەک رەفتاری لە گەڵ قازی بە ئەدەب و مونسیفانە بوو. هەر وەک چاوەروان دەکرا لە گەڵ بیرا رای قازی موافیق بوو کە باشترە ئەرتەش بە بێ خوێن رێژی بچێتە ناومەهاباد.
بارزانیەکان کە ئێستا تاقە پارێزەری شارن پاشە کشە بکەن. قازی محەممەد بە جێگەیاندنی بەشی ئاخری واتە پاشە کشەی بارزانیەکانی وە ئەستۆ گرت. هەر سێ قازی رێگایان درا بۆ بردنە سەری بەڵێنەکانیان بچنەوە مەهاباد. دوای گەرانەوە بۆ مەهاباد قازی محەممەد توانی هاو کات لە گەڵ پاشە کشەی بارزانیەکان بۆ نەغەدە نەخشەی سەرهەنگ دووەم غەفاری کە کوردەکانی موخالیفی بۆ لای شار رێبەری دەکرد، رابگرێ.
ئەرتەشی ئێران لە مەهاباد پێشوازی لێکرا. چاو پێکەوتنی تەشریفاتی لە نێوان قازی محەممەد وفەرماندەکانی ئەرتەشی ئەنجلم درا.

دوای دوو رۆژ قازی محەممەد و هێندێ لە رێبەرانی دەوڵەتی ئەو گیران. سەدری قازی بۆ تاران گەرایەوە بەو هیوایە کە لە شوێنی نوێنەرایەتی پارلمان لە ئەمنیەتی زیاتر کەلک وەر گرێ. لەم بەینەدا هومایونی مەلا مستەفای بۆ مەهاباد بانگ کرد و لە مەبەست و ئامانجەکانی پرسی. مەلا مستەفا گوتی :( ئەگەر ئەمنیەتی دستە بەر بکرێ، دەچێتەوە بارزان لە

عیراق.) هومایونی ریکی خست که له گەڵ سەرهەنگ غەفاری بچیتە تاران و لەوێ مەسەلەکەی جێبەجێ بکا.

ڕۆژی ۲۸ی دیسامبر چاوم بە دوکتور ئەردەلانی دۆستم سەر نووسەری ڕۆژنامەی کوهستان کەوت. ئەو گوتی : سەدری قازی و مەلا مستەفا هەر تکیان لە تارانن. بۆ ڕۆژی دوایی ڕێکی خست کە چاوم بە سەدری قازی بکەوێ. من لە مەهاباد سەدری قازیم نە دیبوو. ئەویش وە برای خۆی دەچوو. مووی سەری ماشو برنجی ببوو، بەڵام لە برای قەڵەو تر بوو. ئەو چۆنیەتی تەسلیم بوونی مەهاباد وگرتن و چارە نووسی مەهابادیەکانی بۆ باس کردم. برا و ئامۆزای گیرا بوون. هێندێ لەواتیتر بە سەید ئەحمەدی سەید تەهاشەوە بۆ عیراق هەڵاتبوون و لە وێ گیرا بوون. چاپخانە داخرا بوو. ئەوانە هەموو خەبەری نا هومێدی بوون. ترس و نیگەرانی ئەو لە جێی خۆی بوو. ڕۆژی دوایی دوو ئەفسەری ئەرتەشی ئەویان بردە لای قەوام و پاشان بە جیپێکی ئەرتەشی ناردیانەوە مەهاباد تا لە گەڵ برای و ئامۆزای دادگایی بکرێ.

هەر ئەو ڕۆژە، واتە ۳۰ دیسامبر سەرهەنگ غەفاری هاتە دەفتەری من. لە سەقز لە گەڵی ناشنا ببووم. هەر لەو شوێنە کە ئەو ئەفسەری پێوەنداری ژەنراڵ هومایونی و عەشیرەتە کوردەکان بوو، هەڵوێست و ڕەفتاری باشی لە گەڵ عەشایرکاری تێکرد بووم.

ئەو منی بۆ دیتنی مەلا مستەفا بانگ کردە ماڵی خۆی. منیش لە گەڵ کۆلۆنیل(سکستۆن) یەکەمین ڕۆژی ساڵی ۱۹٤۷ چوومی دیداری. غەفاری لە دەرەوەی ماڵەکەی پێشوازی لێکردین. پاشان بە پێپلیکانی

سارد و رزیودا بۆ وه تاغێکی سارد رێنوێنی کردین. به دابی خۆیان چەند کورسی له دەوردی مێزێکی پچوک دانرا بوون. به پیاوێکی کورته بالای ناساندین که چاکەتێکی رەشی له بەردابوو، ئەو پیاوه مەلا مستەفا بوو.

مەلا مستەفا چاو وبرۆیەکی رەشی هەبوو. شکلی سەری نیزیک به چوار گۆشه و مووی پری رەش دایان پۆشیبوو. داوداوەی سپی لێ دەبینران. نێوچاوانێکی کورت و روخسارێکی گرژی هەبوو. بروسکێک له چاوانیدا دەدرەوشا بیچم و ئەندامێکی عادەتی هەبوو. بەلام له وانەیه ده لیباسی کوردی دا له نێو خەلک و عەشایردا سام و هەیبەتێکی بووبێ. ئەو به زاری کوردی فارسی ده پەیڤی. ئەو گوتی کاتێ له عیراق دەر کرام له نیزیک سنور ژەنرال ( لیوبۆف) و ئەفسەرانی دیکەی سۆڤیێتی به ئێمەیان گوت بچنه مەهاباد و بچنه ژێر فەرمانی قازی محەمەد. دوای ٥٠ رۆژ کەسانی خۆم برده مەهاباد و لەو دەمەوه پێوەندی راستەو خۆم له گەل روسان نەبوه. جگه له سەفەرێکی تەورێز که دەمویست خێزانم له خەستەخانەی سۆڤیێت عیلاج بکرێ. لەوه زیاتر هیچ ئەفسەرێکی سۆڤیێت لایەنی راوێژی ئێمه نەبود.

وا دەهاته بەر چاو له هێندێ مەئموری سیاسی ئینگلیز بیره وەریەکی خۆشی هەیه. داخی ئەودی هەبوو که مەئموری دیکەیان له جێگای ئەوان داناوه، ئەو دوکتور ( هوف)یشی له بیر بوو. پاشان ئێمەی برده ژوورێکی دیکه له وێ دوو ئەفسەری کوردی عیراقی دانیشتبوون و هەر تکیان کۆت و شالواری جوانی ئوروپییان له بەر دابوو. یەک لەوان کلاوێکی جوانی له سەر بوو. عیزەت عەزیزم له مەهابەد دیبوو. ئەو دەم نەمدزانی کێیه. به

ئینگلیزی چەند وشەیەکم دواند بوو چاوو دێرانی کورد ئەوەنددیان پێ خۆش نەبوو. ئەو دەم لیباسی جوانی کوردی لە بەر دابوو. سەرو چاوێکی رێک و چاو وبرۆیەکی رەش لە روومەتێکی تاو بردوودا وە (باباعەلی( دەچوو.
ئینگلیزی تەواو قسەی دەکرد بەڵام قەڵەمی و قەدیمی راست وەک ئینگلیزی میر حاجی کە پیاوێکی سمێڵ زەلام بە رومەتێکی سپی و ریشێکی قاوەیی داپۆشیبوو. میر حاج قەت بزەی نە دەهاتێ و تورە دەهاتە بەر چاو. جاریکیان لەرزێکی توندی هاتە دەستی و دەستەکەی لە حەوا دەسوڕاند و دەتگوت خەتی عەرەبی دەنووسێ.
ئەوان هەوڵیان دا روونی کەنەوە کە بۆ چی لە ئەرتەشی عیراق رایان کردوە و هاتوونە نێو شۆرشی مەلا مستەفاوە. عیزەت دەیگوت: لە زەمانی وەزارەتی نوری سەعید دا کە لە گەڵ کوردەکان مودارای هەبوو، هێندێ لە ئەفسەرانی کورد سەر پەرشتی ناوچەکانی سەروویان دەکرد. تەنانەت وەزیری نێو خۆ ماجید مستەفا پێشنیاری پێکرد بوو کە وەک فەرمانداری نیزامی بچێتە سەروو. بەڵام دوای لاچوونی کابینەی نوری سەعید دەوڵەت دەردە سەری بۆ مەئموورە کوردەکان پێک هێنا. مەئموورە سیاسیە کۆنەکانی ئینگلیز کە وەزعەکە تێدەگەیشتی لایان بردن. بە داخەوە کەسانی تر لە جێگەی ئەوان دانران. قەیرانەکە کاتێ دەستی پێکرد کە مەئمورە تازەکان تازە دەهاتن لە گەڵ بارو دۆخی سەروو ئاشنا بن. عیزەت و میر حاج لەو ١٢ ئەفسەرانەی ئەرتەشی عیراق بوون کە لە گەڵ ٥٠ ئەفسەری ناوچەیی و ئەژمارێک سەر باز و مەئمور و ماموستای عیراقی کە ژمارەیان لە سەدان کەس زیاتر دەبوو ڕەگەڵ بارزانیان

کەوتبوون.

لە مەلا مستەفام پرسی : ( ئێستا دەتەوێ چبکەی ؟ )

- دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ عیراق. ماوەیەکە پێومە بۆ نیشتمان بگەڕێمەوە. بەڵام دەوڵەتی عیراق ئەمنیەت نادا بە ئێمە. ئەگەر وتو وێژمان لە گەڵ عیراق سەر نەگرێ، هیوا دارم کە ئێران پەنامان بدا. ئێران وڵاتی ئێمەیە. ئێمە ئێرانین و ئێرانیەکان لە خۆمانن. ئێمە پێمان خۆشە بگەڕێینەوە بارزان بۆ سەر ماڵ و ژیانی خۆمان. ئەگەر نەشبوو لێرە دەمێنینەوە.

مەلا مستەفا مانگێک لە تاران مایەوە. دوای سەر نەکەوتنی هەول و تەقلای بو دەستە بەری لە ڕێگای بالیوزخانەی ئەنگلیزەوە بێ گەڕانەوەی بێ مەترسی بۆ عیراق لە گەڵ کار بەدەستانی ئێرانی وتو وێژی دەست پێکرد. ئێرانیەکان هەر چەندە ڕێگایان نە دەدا کە پێڕەوانی مەلا مستەفا لە کوردستانی ئێران بمێننەوە، بەڵام ئامادە بوون ئەوان لە ناوچەیەکی شاخاوی لە نێوان کاشان و هەمەدان نیشتە جێ بکەن.

مەلا مستەفا لە کۆتایی سەفەرەکەی دا گەڕایەوە بۆ سەروو تا لەو بارەوە بیر بکاتەوە و لە گەڵ خەڵکەکەشی ڕاوێژ بکا. بەڵام شێخ ئەحمەد لە گەڵ کۆمەڵێکی زۆر ی دیکە بە توندی دژی پێشنیاری ئێران وێستان. هەر چەندە لەوانە بوو مەلا مستەفاش ئەم پێشنیارە قەبووڵ نەکا. ئاخرەکەی بە هومایونیان ڕاگەیاند کە هەر لەو شوێنەی هەن دەمێننەوە و هیچ مەرج و شەرتیش قەبووڵ ناکەن. هومایونی دەستبەجێ لەشکری بۆ سەر کوتکردنیان خستە کار. ئەوان ناچار لە ئاخری فیوریە دا بۆ لای ڕۆژ

ناوای لای سنوری عیراق بزووتن. بەڵام بەفری قورس ڕێگای نەدا لە چیا تێپەڕن، ناچار لە ئێران مانەوە. سەرانسەری مانگی مارس بە شەڕ و پاشە کشە لە گەڵ ئەرتەشی ئێران بردیانە سەر. ئاخرەکەی بویان دەر کەوت کە ناتوانن زیاتر بەر بەردکانی بکەن.

شێخ ئەحمەد هەموو تایفەکەی بردەوە عیراق چونکە دەولەتی عیراق دەستە بەر نامەی بە نووسراو دابوونێ. هەر چەندە ئەو گیانی خۆی پارێزرا، بەڵام ئەفسەرانی کوردی ئەرتەشی عیراق کە لە گەڵیان بوون لەوانە عیزەت عەزیزیش لە مانگی یون دا ئیعدام کران.

وەک پاشان دەر کەوت میر حاج تەکبیرێکی تری ناقڵانەی کرد بوو. ( دەبێ مەبەستی مەلا مستەفا بێ یان هەڵەی وەرگێڕانی فارسی یە ) و. ئەو بە پێچەوانە نەیویست بوو خۆی تەسلیمی دەوڵەتی عیراق بکاتەوە. بەرەو سنور بۆ ڕێگایەکی دیکە ڕۆیشتبوو. ڕێگایەک کە لە چیاوە دەگەیشتە بارزانی نیشتمانی. لە وتو ویژێکدا لە وێ بۆی دەر کەوتبوو کە ناتوانێ بڕوا بە عیراقیە کان بکا، ئێران و تورکیش پەنای نادەن. گۆیا بە جۆرێک لە گەڵ رووسەکان پێوەندی گرتبوو. چونکە ڕۆژی ٢٧ی مانگی مای لە گەڵ ٥٠٠ کەس لە پیاوەکانی سنوریان پەڕاند و هاتنەوە خاکی ئێران.

کاتێ مەلاو بارزانیەکان بۆ لای سەروو خەریکی پێشرەوی بوون، جارێکیش چوونە خاکی تورکیا. شەخسی شا فەرمانی توندی دابوو کە ئەرتەشی ئێران ڕێگا نەدا دوو بارە بێنەوە خاکی ئێران. بەڵام تا ئەو کاتەی لە خۆیە تێپەڕین و لە سنوری سۆڤیێت نیزیک بوونەوە، ئەرتەش نەیتوانی بیانگاتێ. لە وێ لە پێشدا بارزانیەکان پەلاماریان برد و

کوشتارێکی باشیان لە ئەرتەشی ئێران کرد و لە ئاراس پەڕینەوە. قەزاو قەددەر وابوو کە ساڵی ١٩٥٨ دوو بارە بێنەوە عیراق و ببنە دڕک لە چاوی دەوڵەتی عیراقدا کە لە فەسڵەکانی دواییدا بە درێژی باسیان دەکرێ.

بەڵام قازی محەممەد زووتر لە وان توشی چارە نووسی خۆی بوو. هەر سێک قازی لە دادگایەکی نیزامی دا بە نهێنی لە مەهاباد دادگایی کران و رۆژی ٢٣ی ژانویە بە مەرگ مەحکوم کران. بەڵام ئاژینی( ئیجرا) حوکمی ئیعدامیان لە لایەن تارانەوە دوا خرا، چونکە قەوام نەیدە ویست لە کاتی وتو وێژی گرنگ لە گەڵ سۆڤیێت هەراو دەنگی لێ ساز بێ.

ماوەیەکی کەم پێش رۆیشتنی من لە تاران لە فیوریەی ١٩٤٧ژەنراڵ رەزمارا چوە مەهاباد. بەڵگەی ئەو تۆم بە دەستەوە بوو کە بە دڵنیایی بزانم مەئموریەتی چاوە دێرێ بە سەر ئیعدامی برایانی قازی پێ ئەسپێراوە. من چوومە لای بالیوزی خۆمان( جۆرج ئالێن) تا نزانم دەتوانم کارێک بکەم.

بالیوزمان لێی پرسیم :(بۆ چی ئەوەندە نیگەرانی وەزعی قازیەکانی؟ ئەوان لە گەڵ سۆڤیێت هاوکاریان کردوە)

- راستە. بەڵام ئەوان تێکۆشاون ئەوەندەی لە توناییاندا بێ بۆ باشکردنی وەزعی خەڵک کار بکەن. سۆڤیێتیەکان تاقە کوس بوون یارمەتیان داون.

-باشە . چاوە روانی من چیبکەم ؟

- لام وایە تۆ دەبێ داوا لە شا بکەی کە دەستور بدا بە رەزمارا کە قازیەکان بۆ دادگایەکی مونسیفانە و ئاشکرا بێننە تاران

لە سەر ویستی باڵیوزمان شا گورج بانگی کرد. لەم چاو پێکەوتنەدا باڵیوزمان هیواداری خۆی دەر بڕی کە مەسەلەی عەشیرەتەکان و لە وانە مەسەلەی کوردەکانیش بە باشی چارە سەر بکرێ. پاشان گوتی: قازیەکان هەر چەندە لە گەڵ سۆڤیێت هاو کاریان کردوە بەڵام لە بواری فێر کردن و پەروەردە دا خزمەتی زۆریان بە خەڵک کردوە. لێرەدا شا قسەی وی بڕی و بە زەردە خەنەیەکەوە گوتی: ( تۆ ترست هەیە من ئەوان ئیعدام بکەم.؟ ئەگەر مسەلە ئەوەیە دڵنیا بە ئەسڵەن خەیاڵێکی ئاوام نیە.)

بەرە بەیانی رۆژی ٣١ی مانگی مارس قازیەکان بە دەستونی ئەعلاحەزرەتی شاهەنشا لە دار دران. وادیارە راست دوای ئەوەی باڵیوزمان دەرگای کۆشکی پێوە داوە و رۆیشتوە، شا دەستوری ئیعدامی قازیەکانی راگەیاند بوو.

بەر هەمە نوسراوەکانی نووسەر:

١ - کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران

٢ - وەڵامێک کوردی و فارسی

٣ - رێنوێنی شەڕی پارتیزانی

٤ - لە دەوری رێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات کۆ بینەوە

٥ - رەخنەو لێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی

٦ - چەند قسەیەک لە گەڵ خەبات

٧ - کوردو فەرهەنگی بێگانە

٨ - لێکۆڵینەوەی(کەرتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم) کوردی وفارسی

٩ - تایبەتی کۆنگرەی شەشەم

١٠ - کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری

١١ - یادی هێمن

١٢ - لە پێناو چی دا؟

١٣ - یادانەوە

١٤ - کڕوکاش

١٥ - سەفەر بۆ کوردستان

١٦ - لە بیرەوەریەکانم بەرگی: ١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩

١٧ - پێدا چوونەوە(مێژووی بزوتنەوەی نیشتمانی لە کوردستانی ئێران)

ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بە کوردی

١ - دایک - ماکسیم گۆرکی

٢ - ژدان و کردەوەکانی لێنین

٣ - ئەفسانە کوردییەکان - رۆدینکۆ

٥ - زەوی پچوک - برێژنێف

٦ - کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە

٧ - مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید

٨ - یاسای بنچینەیی ئابووری سۆسیالیستی

٩ - حەمە چکۆل - ئینجە مەمەد - یاشار کەمال
١٠ - ئوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە - ژۆرژ پۆلستێر
١١ - نامەی گوللە باران کرلوەکان
١٢ - رەوشی کوردان - مێژووی بابان و ئەردەلان
١٣ - ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس
١٤ - مەسەلەو زار گوتنی لوڕی
١٥ - رۆژەکانی ئێران - ئارچیبالد رۆزوێلت